ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ

# زانستی تەجوید





ئامادەکردنی : م. سیروان حامد

چاپی یەکەم

١٤٣٠ك - ٢٠٠٩ز

# زانستی

# ( تجوید )

ئامادەکردنی : م سیروان حامد

چاپی یەکەم

١٤٢٩ ـ ٢٠٠٩

بسم الله الرحمن الرحيم

{ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاوَتِهِ أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ }

البقرة (١٢١)

# نزاو پاڕانەوەی خەم و پەژارە

**پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت:**

(مَا أَصَابَ أَحَدًا قَطُّ هَمٌّ وَلا حَزَنٌ فَقَالَ:

(اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ ، وَابْنُ عَبْدِكَ ، وَابْنُ أَمَتِكَ ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ ، أَوْ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي ، وَنُورَ صَدْرِي ، وَجِلاءَ حُزْنِي ، وَذَهَابَ هَمِّي)

إِلا أَذْهَبَ اللَّهُ هَمَّهُ وَحُزْنَهُ وَأَبْدَلَهُ مَكَانَهُ فَرَجًا.

قَالَ : فَقِيلَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَلا نَتَعَلَّمُهَا ؟ فَقَالَ: بَلَى ، يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهَا أَنْ يَتَعَلَّمَهَا )[1]

(واتە: هیچ کەسێك نی یە کەخەم وپەژاردیەکی تووش ببێت و بلێت:

(خوایە من بەندەی تۆم و کوڕی بەندەی تۆم و کوڕی کەنیزەکی تۆم،ناوچەوانم بەدەست تۆیەو بڕیارت بەسەرمدا

---

[1] رواه أحمد عن ابن مسعود رضي الله عنه (ج١ ص٣٩١ برقم : ٣٧١٢ ) وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة (١٩٩) .

ڕابووردووه،فـەرمانت بەسـەرمدا دادپەروەرانەیـە، داوات لـێ دەکەم بەهەموو ناوێك کەهی تۆیەو خۆتت پێ ناو ناوه، یا لەکتێبەکەتدا ناردووتەتە خوارەوه، یا فێری یەکێك لەدروست کراوەکانت کردووه، یان لە عیلمی غەیبدا لای خۆت هەڵت گرتووه، قورئان بکەیتە بەهاری دڵم‌و نوری سنگم‌و لابەری خەم‌و پەژارەم )

ئیللا خوای گەورە خەم و پەژارەکەی لادەبات و بۆی دەگۆڕێ بە خۆشی و شادی.

دەڵێ:

وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەبەری نەکەین ؟

فەرمووی: بەڵێ پێویستە هەرکەسێك کە دەیبیستێت لەبەری بکات.

# پێشەكی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا إنه من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ) (آل عمران:١٠٢)

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً) (النساء:١)

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً) (الأحزاب:٧٠-٧١)

أما بعد ؛ فإن أصدق الحديث كتاب الله تعالى، وخير الهدي هدي محمّدﷺ، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

**خوێنەری بەڕێز:**

**بێگومان یەكێك لەكردەوە پیرۆزو هەرەچاكەكان خوێندنی قورئانی پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرموێ:** { إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَأَنْفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَنْ تَبُورَ } [فاطر: ٢٩]

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە پەڕاوەکەی خوا ئەخوێننەوە و، نوێژی ڕێك و پێك ئەکەن و، لەو ڕۆزییەی پێمان داون بەنهێنی و بەئاشکرا دەبەخشن، بەئومێدی بازرگانییەکن کەهەرگیز لەبرەو ناکەوێ، تاخوای گەورە لەبەرامبەر هەوڵەکانیان بەچاکی پاداشتیان بداتەوەو لەبەهرەی خۆی زێدەشیان بداتێ، چونکە بەڕاستی ئەو لێبووردەو پێزان و پاداشت دەرەوەیە .

پێغەمبەری پێشەوایشمانﷺ دەفەرموێ : (اقرءوا القرآن فإنه يأتي يوم القيامة شفيعا لأصحابه)

واتە: قورئان بخوێنن چونکە لەڕۆژی دوایی دا تکا کارە بۆ خاوەنەکانی خوێندنەوەی قورئانیش جیاوازە لەهەموو کتێبێکی تر،چونکە بنەماو یاسای تایبەتی خۆی هەیە، کەپێویستە لەسەر هەموو موسڵمانیك جیٚ بەجێیان کات لەکاتی خوێندنیدا.

منیش لەسۆنگەی ئایەتی:{وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى} [المائدة:٢] خوای گەورە سەرکەوتوی کردم کە ئەم کتێبە بەناونیشانی (زانستی تەجوید) بخەمە بەردەست خوێنەری بەڕێزەوە بەهیوای سوود لیٚ وەرگرتنی.

جانەگەر لەئامادەکردن و وەرگێڕانی بابەتەکەدا پێکابێتم ئەوا فەزلٚ و بەخششی پەروەردگارە، ئەگەر کەم و کوڕی تێدابوو ئەوا داوای لێبووردن دەکەمو، داواکارم لەخوای بەبەزەیی بیخاتە تەرازووی چاکەکانم.

دەست خۆشی لەهەر خوشك و برایەك دەکەم کەلەهەر کەم و کوڕی و هەڵەو بیرچوونێك – کەهیچ کەس لێیان بەدوور نابێت – ئاگادارم بکاتەوە.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لاإله إلاّ أنت، أستغفرك وأتوبُ عليك .

هەڵەبجەی تازە

٢٢ جمادي الثاني ١٤٣٠

١٥/ ٦/ ٢٠٠٩

# بەشی یەکەم

## زانستی ( تجوید )

وشەی (تجوید) لەزمانەوانیدا واتە: جوانکاریو شارەزابوون.

لەزاراوەشدا: زانستێکە ئەو بنەماو یاسایانە ڕووندەکاتەوە کەپێویستە ڕەچاو بکرێن لەکاتی قورئان خوێندندا، بەو شێوەیەی کە هاوەڵان خوایان لێ ڕازی بێت لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) وەریانگرتووە.

## گرنگی تەجوید:

بەڕاستی تەجوید هۆکارێکە بۆ گەیشتن بەمەبەستێك، ئەو مەبەستەش لەم چەند سوودەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:

١- پەرستنو جێبەجێنانی فەرمانی خواو، شوێنکەوتنی پێغەمبەرە(ﷺ) لەچۆنیەتی خوێندنی قورئاندا.

٢- دەرکەوتنی ئیعجازی قورئان.

٣- ڕوونبوونەوەی جیاوازی نێوان خوێندنەوەی قورئان و خوێندنەوی کتێبی ئاسایی.

٤- جوانکردنی خوێندنەوەو ڕازاندنەوەی.

٥- لەسەر خۆیی وهێواشی کەهەل دەڕەخسێنی بۆ :

أ- تێڕامان و ووربوونەوە و تێگەشتن لەقورئانی پیرۆز .

ب- ملکەچبوون بۆ خوا.

ج- دەربڕین بەشێوەیەکی ڕاست و ڕەوان .

٦- بەدیلێکی شەرعی جوانە بۆ مۆسیقاو ... هتد .

٧- فێربوونی شێوازی (عثماني) کەقورئانی پێ نووسراوە .

٨- فێری قسەو دەربڕینمان دەکات بەشێوازێکی هێمن و جوان .

## چۆنێتی وەرگرتنی ئەم زانستە

١- گوێ گرتنی فێرخواز بۆ خوێندنی مامۆستا،ئەمە شێوازی پێشینانە.

٢- گوێ گرتنی مامۆستا بۆ خوێندنی فێرخوازو ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی .

واباشترە سوود لەهەردوو رشێوازەکە وەربگیرێت .

## حوکمی فێربوونی تەجوید

سەبارەت بە حوکمی فێربوونی تەجوید و جێبەجێکردنی یاساکانی زانایان دوو ڕایان هەیە:

یەکەم: فێربوون و شارەزابوونی ئەم زانستە بەشێوەی تیۆری(نظري) فەرزی کیفایەیە، بەڵام جێبەجێکردنی لەکاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا، واتە بەشێوەی کرداری(عملي) فەرزی عەینەو پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك ژن بێت یان پیاو لەکاتی قورئان خوێندندا پەیڕەوی بکا، ئەمە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە.

دووەم: ڕەچاوگرتن و جێبەجێکردنی بنەماو یاساکانی ئەم زانستە سوننەتەو پابەندبوون پێوەی لەکاتی قورئان خوێندندا شتێکی باشە، ئەمە ڕای شەرعزانان(فقهاء)ە، بەڵام ڕای یەکەم بەهێزترە.[٢]

---

[٢] محمد بن صالح العثيمين ڕەحمەتی خوای لێبێت لە کتێبی (شرح رياض الصالحين ل١١٤٠ . ١١٥٤) دا ڕای دووەم بەپەسەند دەزانێت.

## گەورەیی و پاداشتی فێربوونی قورئان و فێرکردنی

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ هَـذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْراً كَبِيراً ﴾[٣]

واتە: بێ گومان ئەم قورئانە ڕێگاو بەرنامەیەکی وا نیشانی خەڵکی دەدا، کەڕاستترین ڕێگایەو مژدەیش دەدا بەو بڕوا دارانەی کە کارو کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن کە بەڕاستی پاداشتێکی زۆر گەورەیان بۆ هەیە لەبەهەشتدا.

٢- عن عقبة بن عامر ﷺ قال: خرج رسول الله صلى الله عليه وسلم ونحن في الصفة فقال: ((أيّكم يحب أن يغدو كل يوم إلى بطحان أو إلى العقيق فيأتي منه بناقتين كَوْماوين في غير إثم ولا قطع رحم))؟ فقلنا: يا رسول الله نحب ذلك، قال: ((أفلا يغدو أحدكم إلى المسجد فيعلم أو يقرأ آيتين من كتاب الله عز وجل خير له من ناقتين وثلاث خير له من ثلاث، وأربع خير له من أربع ومن أعدادهن من الإبل؟ ))[٤]

واتە : (عقبة )ی کوڕی (عامر) دەڵێت : لەکاتێکدا ئێمە لە (الصفة)[٥] دا دانیشتبووین پێغەمبەری خوا ﷺ هات و فەرمووی:

---

[٣] {الإسراء ٩}

[٤] أخرجه مسلم (٧٠٣)

[٥] جێگایەکی سەرگیراو بووە لەبەشی دواوەی مزگەوتەوە دروست کراوە بۆ ئاوارەو هەندێك لەکۆچەران.

کام لەئێوە حەز دەکات کە هەموو ڕۆژێك سەر لەبەیانی بچێت بۆ (بطحان) یان (العقیق)و دوو وشتری کۆپارە گەورەی قەڵەو لەوێ بێنێتەوە بێ ئەوەی گوناهبار ببێت یا دڵی هیچ خزمێکی لێ بئێشێت؟ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموومان حەز بەوە دەکەین.

فەرمووی: ئەی ناکرێت هەر یەکێ لەئێوە سەر لەبەیانی بڕوات بۆ مزگەوت و دوو ئایەت لە قورئان فێر ببێت یان بخوێنێت کە باشترە بۆی لەدوو وشتری مێ، سیانیش باشترە بۆی لە سیان و چواریش باشترە بۆی لەچوار، و بە ئەندازەی ژمارەی ئایەتەکان باشترە بۆی لە وشتر.

٣- عن عثمانَ بن عفانَ ﷺ قال : قالَ رسولُ اللّهِ ﷺ: « خَيرُكُم مَنْ تَعَلَّمَ القُرْآنَ وَعلَّمهُ» [٦]

واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە قورئان فێر ببێت و کەسانی تریش فێرکات.

٤- عن أبي هريرة ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ : (... ما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله، ويتدارسونه بينهم ؛ إلا نزلت عليهم السكينة، وغشيتهم الرحمة، وحفتهم الملائكة، وذكرهم الله فيمن عنده.)[٧]

واتە: هەر کۆمەڵێك کۆببنەوە لەماڵێك لەماڵەکانی خواو قورئان بخوێننەوەو بەیەکتری بڵێنەوە، ئەوا بێگومان ئارامی دادەبەزێت بەسەریانداو، بەزەیی دایان دەپۆشێت و، فریشتەکان چواردەوریان دەدەن و، خوای گەورەش باسیان دەکات لای ئەوانەی کەلای ئەون.

٥- عن أنس بن مالك ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ : إن لله أهلين من الناس . قالوا يا رسول الله: من هم ؟ قال: هم أهل القرآن أهل الله وخاصته)[٨]

---

[٦] رواه البخاري (٥٠٢٧)

[٧] رواه مسلم (٢٦٩٩)

واته: بەڕاستی خوا لەناو خەڵکیدا دۆستی هەیە . وتیان : کێن ئەوانە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟

فەرمووی: ئەوانە قورئان خوێنەکانن، دۆست و هەلبژێرراوی خوان.

٦- عن عمرَ بن الخطابِ ﷺ أنَّ النَّبيَّ (ﷺ)قال : « إِنَّ اللَّه يرفَعُ بِهذَا الكتـــاب أَقواماً ويضَعُ بِهِ آخَرين »[٩]

واته : بەڕاستی خوا بەهۆی ئەم قورئانەوە چەند گەل و هۆزێك سەربەرز دەکات و چەندانی تریش نزم ونەوی دەکات.

٧- عن أبي مسعودٍ ﷺ أنَّ النَّبيَّ ﷺ قال: (يؤمّ القوم أقرؤهم لكتاب الله وأقدمهم قراءةً)[١٠]

واتـە: ئـەوەی پێـشنوێژی دەکـات بـۆ خـەڵك باشـارەزاترینیان بێـت لەخوێندنی قورئاندا.

٨- عن أبي أمامة قال سمعت رسول الله ﷺ يقول : ( اقرءوا القرآن فإنه يأتي يوم القيامة شفيعا لأصحابه )[١١]

واته: قورئان بخوێنن چونکە لەڕۆژی دوایی دا تکا کارە بۆ خاوەنەکانی.

---

[٨] رواه أحمد في مسنده ; وابن ماجة في سننه وصححه الألباني (٤٢/١ برقم ٢١٥)

[٩] رواه مسلم (٨١٧)

[١٠] رواه مسلم (٦٧٣)

[١١] رواه مسلم (٨٠٤)

٩- عن عائشة رضي الله عنها قالتْ : قال رسولُ اللّهِ (ﷺ):« الّذِي يَقرَأُ القُرْآنَ وَهُو ماهِرٌ بِهِ معَ السَّفَرةِ الكرَامِ البررَةِ ، والذي يقرَأُ القُرْآنَ ويَتَتَعْتَعُ فِيهِ وَهُو عليهِ شَاقٌ له أجْرَان »[12]

**واتـه : ئـهو كهسـهى قورئـان بـهرهوانى دهخوێنێتـهوه لهگـهڵ فريـشته بهرێزو پاكهكانداية، ئهو كهسهشى قورئان دهخوێنێت و زمـانى تهتهڵـه دهكات تيايداو لهسهر زارى قورسه دوو پاداشتى ههيه .**

١٠- عن أَبِي موسى الأشعريِّ ﷺ قال : قال رسولُ اللّهِ (ﷺ): « مثَلُ المؤمنِ الّذِي يقْرَأُ القرآنَ مثلُ الأُتْرُجَّةِ : ريحهَا طَيِّبٌ وطَعمُهَا حلْوٌ ، ومثَلُ المؤمنِ الّذي لا يَقْرَأُ القُرْآنَ كَمثَلِ التّمرةِ : لا رِيح لهَا وطعْمُهَا حلْوٌ ، ومثَلُ المُنَافِقِ الذي يَقْرَأُ القرْآنَ كَمثَلِ الرَّيحَانَةِ : رِيحها طَيِّبٌ وطَعْمُهَا مرٌّ ، ومَثَلُ المُنَافِقِ الذي لا يَقْرَأُ القرآنَ كَمثَلِ الحَنْظَلَةِ : لَيْسَ لَها رِيحٌ وَطَعمُهَا مُرٌّ »[13]

**واتـه: نموونـهى بـڕوادارى قورئـان خوێن وهك نموونـهى نارنجـه، بـۆنى خۆشـهو تاميـشى خۆشـه، بـڕوادارى قورئـان نـهخوێنيش وهك خورمـا وايه، بۆنى نييهو تامى شيرينه، نموونهى دوو ڕووى قورئان خـوێنيش وهك رێحانه وايه بۆنى خۆشهو تامى تاڵه، نموونهى دوو ڕووى قورئـان نهخوێنيش وهك كوژاڵكه وايه، بۆنى نييهو تاميشى تاڵه.**

١١- عنِ ابن عمر رضي اللّه عنهما عن النّبيِّ (ﷺ) قال: « لا حَسَدَ إلاَّ في اثْنَتَيْن: رجُلٌ آتَاهُ اللّه القُرآنَ ، فهوَ يقومُ بِهِ آناءَ اللّيلِ وآناءَ النّهَارِ، وَرجُلٌ آتَاهُ اللّه مالا ، فهُو يُنْفِقهُ آناءَ اللّيْلِ وَآناءَ النهارِ »[14]

---

[12] متفق عليه ، صحيح البخاري (٤٦٥٣)،صحيح مسلم (٧٩٨).

[13] متفق عليه ، أخرجه البخاري (٥٤٢٧)، ومسلم (٧٩٧).

[14] متفق عليه ، أخرجه البخاري في التوحيد (٧٥٢٩)، ومسلم في صلاة المسافرين (٨١٥).

واتە: ئیرەیی بردن دروست نییە لەدوو شتدا نەبێت : پیاوێك خوا قورئانی پێ خەلآت کردبێ بەردەوام هەستێ بەخوێندنی بەڕۆژوو بەشەو، پیاوێکیش خوا سامانی پێبەخشیبێت بەردەوام لەڕێی خوادا خەریکی بەخشینی بێت بەشەو بەڕۆژ.

١٢- عنِ البراء بنِ عَازِبٍ ﷺ قال : كَانَ رَجلٌ يَقرَأُ سورةَ الكَهْفِ، وَعِنْدَه فَرسٌ مَربوطٌ بِشَطَنَيْنِ فَتَغَشَّته سَحَابَةٌ فَجَعَلَت تَدنو، وجعلَ فَرسُه ينفِر مِنها. فَلَمَّا أصبح أتَى النَّبِيَّ (ﷺ). فَذَكَرَ له ذلكَ فقال: « تِلكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلتْ للقُرآنِ»[15]

واتە: (البراء) دەڵێت : پیاوێك سورەتی (الکهف)ی دەخوێند، ئەسپێکی لەلابوو بەدوو گوریسی درێژ بەسترابوویەوە، پەڵە هەورێك دایگرتەوەو هەربەسەریەوە سووڕی دەخواردەوە لێ ی نزیك دبوویەوە، ئەسپەکەشی هەر لێ ی ئەسڵەمیەوە، کەڕۆژ بوویەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەرو ﷺ بۆی باس کرد، ئەویش فەرمووی: (ئەوە ئارامی بووە لەبەر قورئان دابەزیوە).

١٣- عن ابن مسعودٍ ﷺ قالَ : قال رسولُ اللَّهِ (ﷺ): منْ قرأَ حرْفاً مِنْ كتاب اللَّهِ فلَهُ حسنَةٌ ، والحسنَةُ بِعشرِ أمثَالِهَا لا أقول : الم حَرفٌ ، وَلكِن : أَلِفٌ حرْفٌ، ولامٌ حرْفٌ ، ومِيمٌ حرْفٌ »[16]

واتە: هەرکەسێك پیتێك لەپەڕاوی خوا(قورئان)بخوێنێت چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، چاکەکردنیش بەدەئەوەندەی خۆیەتی، من ناڵێم (الم) پیتێکە، بەڵکو (اَلِف) پیتێکەو (لام)یش پیتێکەو (میم) یش پیتێکە .

---

١٥ متفقٌ عليه ، أخرجه البخاري في فضائل القرآن (٥٠١١)، ومسلم في صلاة المسافرين (٧٩٥).

١٦ رواه الترمذي، بڕوانە: السلسلة الصحيحة (٣٣٢٧).

## دەنگ خۆش کردن لەکاتی قورئان خوێندندا

١- عن البراء ﷺ قال : سمعت النَّبي (ﷺ) يقرأ { والتين والزيتون } في العشاء، وما سمعتُ أحداً أحسن صوتاً منه أو قراءة.[17]

واتە: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو کەلەنوێژی خەوتنان سورەتی {والتين والزيتون}ی دەخوێندەوە، گوێم لەکەس نەبووە کەوەك ئەو دەنگی خۆش بێت یان جوانتر بیخوێنێتەوە.

٢- عن أبي هريرة ﷺ قال: قال رسول الله: « ما أذن الله لشيء ما أذن لنبي حسن الصوت يتغنى بالقرآن يجهر به )[18]

واتە: خوای گەورە گوێی لەهیچ شتێك نەگرتووە ئەوەندەی گوێ ی لەپێغەمبەرێکی دەنگ خۆش گرتووە بەئاوازێکی خۆش و بە ئاشکرا قورئان بخوێنێت.

٣- عن البراء بن عازب ﷺ أن رسول الله(ﷺ) قال: ( زينوا القرآن بأصواتكم؛ فإنّ الصوتَ الحسن يزيدُ القرآنَ حُسناً )[19]

واتە: قورئان برازێننەوە بە دەنگەکانتان، بێگومان دەنگی خۆش جوانی زیاتر دەبەخشێت بە قورئان.

٤- عن سعد بن أبي وقاص ﷺ قال : قال رسول الله(ﷺ) « ليس منا من لم يتغن بالقرآن »[20]

واتە: لە ئێمە نییە ئەو کەسەی بەدەنگەوە قورئان نەخوێنێت.

---

١٧ رواه البخاري ( ٧٣٥ ) ومسلم ( ٤٦٤ ) .

١٨ أخرجه البخاري: فضائل القرآن (٥٠٢٣)، ومسلم: صلاة المسافرين (٧٩٢).

١٩ رواه أحمد وأبو داود وابن ماجة والحاكم وصححه الألباني في صحيح الجامع (٣٥٨٠ ).

٢٠ أخرجه البخاري برقم (٧٥٢٧)

٥- عن أبي موسى رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال له: ( يا أبا موسى لقد أوتيت مزماراً من مـــزامير آل داود )[21]

واتـه: ئـەی (ابـو موسـی) بەڕاسـتی تـۆ دەنگێکی خۆشت لەدەنگەخۆشـەکانی بنەماڵەی داودت پێدراوە .

## گەورەیی و پاداشتی قورئان لەبەرکردن

١- عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال : قال رسول الله (ﷺ) يقال لـــصاحب القـــرآن إذا دخل الجنة اقرأ واصعد، فيقرأ ويصعد بكل آية درجة حتى يقرأ آخر شيء معه[22]

واته: بەقورئان خوێن دەوترێت کاتێك دەچێتە بەهەشتەوە : بخوێنەو ســەرکەوە، ئــەویش دەخـــوێنێ و بەخوێنـــدنی هـــەموو ئایـــەتێك لەبەهەشتداپلەیەك سەردەکەوێت، تا کۆتا ئایەت کەلەبەری کردووە.

٢- عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: إن من إجلال الله إكـــرام ذي الشيبة المسلم، وحامل القرآن غير الغالي فيه ولا الجافي عنه، وإكرام ذي السلطان المقسط. [23]

واتـه: بەڕاسـتی ڕێزگـرتن لـە:پیرو بەساڵاچووی موسـڵمان و قورئـان لەبـەرێك کەتونـد ڕەوی و شـلگیری تێـدا نـەکردبێت و فەرمانڕەوایـەکی دادپەروەر، ڕێزگرتنە لەخوای گەورە.

[21] رواه البخاري: فضائل القرآن (٥٠٤٨)، ومسلم: صلاة المسافرين (٧٩٣).

[22] رواه أبوداود ؛ بروانه: (السلسلة الصحيحة للألباني ) رقم( ٢٢٤٠ )

[23] رواه أبو داود في سننه، وابن أبي شيبة في المصنف، والبيهقي في الشعب وحسّنه ابن حجر في التلخيص الحبير(٢/١٨١) والألباني في صحيح أبي داود رقم ( ٤٠٥٣ )

٣- عن أبي موسى الأشعري ﷺ عن النبي(ﷺ) قال: « تعاهدوا القرآن فوالـذي نفسي بيده لهو أشد تفصيًا من الإبل في عقلها »[٢٤]

**واته: بەردەوام بن لەپیاچوونەوەی قورئان، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە خێراتر لەدەست دەرئەچێت لەو وشترەی کە جڵەوی لەدەست ئەدرێ و ناگیرێتەوە .**

٤- وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسول الله(ﷺ): « إن الذي ليس في جوفه شيء من القرآن كالبيت الخرب »[٢٥]

**واتە : ئەوکەسەی هیچ لەقورئانی لەسنگدا نییە(هیچی لێ لەبەر نەکردبێت ) وەك خانووی وێران وایە .**

٥- عن عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قال: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: لَوْ جُعِلَ الْقُرْآنُ فِي إِهَابٍ ثُمَّ أُلْقِيَ فِي النَّارِ مَا احْتَرَقَ.[٢٦]

**واتە: ئەگەر قورئان بخرێتە ناو پێستێك و فرێبدرێتە ناو دۆزەخەوە ناسوتێت، ( هەر ئیماندارێك قورئانی لەبەر بێت ئاگری دۆزەخ نایسوتێنێ، لەشی قورئان لەبەر دەبێتە پێستێك بۆ قورئانەکە)**

---

[٢٤] متفق عليه، البخاري (٤٦٤٧) ، ومسلم (٧٩١)

[٢٥] رواه أحمد(١٩٤٧)، والترمذي(٢٩١٣)، وضعّفه الألباني في ضعيف الجامع برقم (١٥٢٤) وأبو إسحاق الحويني في فتاواه الحديثية : (٦٤/١)، والأرنؤوط في تحقيقه لمسند أحمد(١/ ٤٢٣، برقم ٤٠٢٠).

[٢٦] رواه أحمد في " المسند : ٤ / ١٥١ ، ١٥٥ ، والدّارميُّ في " السنن " : ٢/ ٤٣٠، وأبو يعلى في "المسند" : ٢/ ٣٠٧ رقم ( ١٧٣٩ )،وحسّنه الألباني في (السلسلة الصحيحة : ٣٥٦٢ )، وضعفه بعض المحققين منهم شعيب الأرنؤوط، لسوء حفظ ابن لهيعة.

## جۆرەکانی خوێندنەوەی قورئان

١-التحقیق: خوێندنەوەی قورئان بەهێواشی و لەسەرخۆیی، لەگەڵ تێڕامان و وردبوونەوە لەواتاکانی و، بەڕەچاوگرتنی گشت یاساکانی (تجوید). ئەم جۆرە خوێندنەوەش مەزهەبی (حمزة) و (ورش)ە.

٢- الحَدَر: خوێندنەوەی قورئان بەخێرایی،لەگەڵ ڕەچاوگرتنی یاساکانی (تجوید)و (إعراب). ئەم جۆرەش مەزهەبی (إبن کثیر)و (ابوجعفر)و (أبوعمرو)و (یعقوب)ە .

٣- التدویر:حاڵەتی مام ناوەند، کە پەسەند کراوە لەلایەن زۆرینەی زانایان و خوێنەرانەوە .

**هەر سێ جۆرەکەش لەدێڕێك شیعردا کۆکراونەتەوە:**

حدر وتدویر وتحقیقٌ تری جمیعها مراتبا لمن قرا.

**خوێندنەوەش بەهەرکام لەم سێ جۆرە دروستەو، لەژێر ئایەتی ﴿ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً ﴾[٢٧] جێی دەبێتەوە .**

## ڕەوشت و ئادابەکانی قورئان خوێن

**١- نیاز پاکی بۆ خوای تاکو تەنهاو دوور کەوتنەوە لەڕووپامایی و شۆرەت.**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت :** « من قرأ القرآن فليسأل الله به فإنه سيجيء أقوام يقرؤون القرآن يسألون به الناس »[٢٨]

---

[٢٧] المزمّل: (٤٠)

[٢٨] رواه الترمذي (٢٩١٧)، وأحمد ( ١٩٩٤٤ )،وابن أبي شيبة ، والطبراني ، والبيهقي عن عمران بن حُصين ، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة :٢٥٧)

**واته: هەرکەسێك قورئانی خوێند با داوای پێبکات لەخوا، چونکە لە داهاتوودا خەڵکانێك پەیدا دەبن قورئان دەخوێننو بەهۆیەوە داوا لەخەڵکی دەکەن.**

**هەروەها دەفەرموێت :** (اقرؤوا القرآن ولا تغلوا فيه ولا تجفوا عنه ولا تأكلوا به ولا تستكثروا به)[29]

**واته: قورئان بخوێنن و زێدەڕەوی و شلگیری تێدا مەکەن و، بەهۆیەوە مەخۆن وماڵی پێ زیاد مەکەن.**

**هەروەها(عبادة) کوڕی (الصامت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆربەی کات سەرقاڵبوو کاتێك کۆچەرییەك خۆی دەگەیاندە لای، دەیدایە دەست پیاوێك تاکو قورئانی فێرکات ،جارێکیان پیاوێکی دایە دەست من لەماڵەوە لەلام دەمایەوەو ئێواران لەخواردنی ماڵەوە خواردنم پێدەداو قورئانم فێردەکرت، دوای گەڕانەوەی بۆلای کەسوکاری کەوانێکی بەخەڵات بۆ ناردم ،تائێستە لەو کەوانە چاکترو جوانترم نەبینیبوو، منیش ڕۆشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتم :** فقلت ما ترى يا رسول الله(ﷺ) فيها ؟

فقال : ( جمرة بين كتفيك تقلدها أو تعلقتها)[30]

**واته: سکڵێکە لەنێوان هەردوو شانتدایە ، لەملی دەکەیت یان هەڵی دەواسیت.**

---

[29] رواه أحمد ، والطبراني ، والحاكم ، والبيهقي عن عبادة بن الصامت و قال ابن حجر في الفتح : سنده قوي ، وصححه الألباني (السلسلة الصحيحة :٢٦٠)

[30] رواه أبوداود ، وأحمد وصححه الألباني في صحيح أبي داود (٢٩١٦) ،و شعيب الأرنؤوط في مسند أحمد (٣/٢)

**٢- باشتر وایه له حاڵەتی لەش گرانی و، بێ دەستنوێژی دا قورئان نەخوێنرێت.**

**٣- پاك وخاوێنی شوێن ولەش و جل وبەرگ .**

**٤- پاككردنەوەی دەم به (سیواك ).**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** « إنّ العبدَ إذا تسوّك ثمّ قام يصلّي قام الملك خلفه فسمع لقراءته فيدنو منه أو كلمة نحوها حتى يضعَ فاه على فيه وما يخرج من فيه شيءٌ من القرآن إلا صار في جوف الملك فطهّروا أفواهَكم للقرآن.[٣١]

**واته: بەڕاستی هەربەندەیەك (سواك) بەكاربهێنێ و هەستێ نوێژ بكات، فریشتەیەك لەپشتییەوە دەوەستێ و گوێ لە خوێندنی دەگرێت و، لێی نزیك دەبێتەوە تاوەكو دەم دەخاتە ناو دەمی ، بەراستی ئەو قورئانەی كە لەدەمی دێتە دەرەوە دەچێتە ناو سنگی فریشتەكەوە، كەوابوو دەمتان پاككەنەوە بۆ قورئان.**

**پێشەوا علی (ﷺ) دەڵێت :** ( إنّ أفواهكم طُرقٌ للقرآن فطيّبوها بالسواك)[٣٢]

**واتە: بەڕاستی دەمتان ڕێگایە بۆ قورئان، كەوابوو پاكی بكەنەوە بە (سیواك).**

**٥- سوننەتە ڕوو لە ڕووگە (قبلە) بكرێت، بەڵام بەپێوەو لەكاتی ڕێكردنداو بەدانیشتن و لەسەر تەنیشت و بەڕاكشانیش دروستە.**

**خوای گەورە دەفەرموێت :** ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾[٣٣]

---

[٣١] رواه البيهقي عن علي بن أبي طالب (٣٨/١) وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة (١٢١٣)

[٣٢] رواه بن ماجة وصححه الالباني في السلسلة الصحيحة (١٢١٣)

[٣٣] (آل عمران ١٩١)

واتە: ئەو کەسانەی بەپێوەو بەدانیشتن و لەسەر تەنیشت و ڕاکشان یادی خوا دەکەن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : «إنَّ لكلّ شيء سيّداً وإن سيّدَ المجالس قبالة القبلة »[٣٤]

واتە: بەڕاستی هەموو شتێك گەورەیەکی هەیەو، گەورەی هەموو نشتگەیەکیش بەرامبەر ڕووگەیە.

٦- خوێندنی (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾[٣٥]

واتە: جا هەرکە ویستت قورئان بخوێنیت ،بەر لەوە پەنا بگرە بەخوا لەشەیتانی نەفرین لێ کراو.

٧ – مل کەچ بوون و ئارام گرتن لەگەڵ هەست کردن بەگەورەیی ئەو زاتەی فەرمایشتەکەی دەخوێنیتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُتَصَدِّعاً مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[٣٦]

واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان بۆسەر کێوێك دابەزاندایە ، ئەوا دەتبینی بەکزیی و لەت لەت بوویی لەترسی خوا، ئێمە ئەم نموونانە لەقورئاندا چەند شێوەو وێنەیك دێنینەوە بۆ خەڵکی بەڵکو بیر بکەنەوەو تێ بگەن.

خوای گەورە دەفەرموێ :﴿وَيَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعاً ﴾[٣٧]

---

[٣٤] رواه الطبراني عن أبي هريرة ، وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب. (١٠٧/٣)

[٣٥] (النحل ٩٨)

[٣٦] (الحشر ٢١)

[٣٧] (الإسراء ١٠٩)

واتـه: هـەر كـات قورئانيـان بـۆ بخوێنرێتـەوە چـەناكە نـەوی دەكـەن وەگرين و ئيمانيان زياتر دەبێت.

٨- ورد بوونەوەو بيركردنەوە لە ئايەتەكانی .

خوای گەورە دەفەرموێ :﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا﴾[٣٨]

واتـه: ئايـا ئەوانـە بـۆ لەئايەتـەكانی قورئـان ڕانـامێنن و بـير ناكەنـەوە، بەڵكو ئەوانە قوفڵ لەسەر دڵيان دراوە .

هەروەها دەفەرموێ:

﴿كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ﴾[٣٩]

واته: ئەمەكتێبێكی پيرۆزە، دامان بەزاندووە بۆتۆ ئەی محمد(ﷺ)تا ئەوانـە لـە ئايەتەكانی ڕابمێننو، ژيرو هۆشيارەكانيش ئامۆژگاری لێوەرگرن.

پێشەوا(علی) يش (ﷺ) دەڵێت : لا خير في عبادة لا فقه فيها، ولا في قراءة لا تدبر فيها.[٤٠]

واته: خێر لەو بەندايەتيەدا نی يە كەتێگەشتنی تێدا نەبێت و، هەروەها ئەو خوێندنەوەش ورد بوونەوەی تێدا نەبێت.

(ابن عباس) يش (ﷺ)دەڵێت : لأن أقرأ البقرة في ليلة فأدَّبَّرها وأرتلها أحب إليَّ من أن أقرأ القرآن أجمعَ هَذْرَمَةً.[٤١]

واتـه: بەڕاستـی ئەگـەر سـورەتی (البقـرة) لەشـەوێكدا بەتێگەشـتنەوە و بەجوانی و لەسەرخۆيی بخوێنمەوە پێم خۆشترە لـەوەی هـەموو قورئـان بەپەلە بخوێنمەوە.

---

[٣٨] (محمد ٢٤)

[٣٩] (ص ٢٩)

[٤٠] إحياء علوم الدين، بتخريج الحافظ العراقي (٢/ ٤٢)

[٤١] فضائل القرآن، لابن كثير: ١٥٧.

**٩- خوێندنـــەوەی قورئـــان بـــە لەســـەرخۆیی و بـــێ پەلـــەکردن و خـــەتم نەکردنی لەماوەی سێ شەو کەمتردا.**

**خوای گەورە دەفەرموێ :** ﴿ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً ﴾[٤٢]

**واتە: زۆر بەجوانی و لەسەر خۆیی قورئان بخوێنەرەوە .**

**پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دەفەرموێت:**

لا يفقهُ من قرأ القرآن في أقل من ثلاث.[٤٣]

**واتە: تێناگات لەقورئان کەسێك لەماوەی سێ ڕۆژ کەمتردا بیخوێنێتەوە.**

**١٠- داوا کردنی بەزەیی لەخوا لەکاتی خوێندنی ئایەتەکانی بەزەیی و پەنا گرتن بەخوا لەسزاکانی لەکاتی ئایەتەکانی سزادا .**

عن عوف بن مالك الأشجعي قال : قمت مع رسول الله (ﷺ) ليلة فقام فقـــرأ ســـورة البقرة لا يمر بآية رحمة إلا وقف فسأل ولا يمر بآية عذاب إلا وقف فتعوّذَ.[٤٤]

**واتە: شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ)نوێژم کرد، سورەتی (البقرة)ی خوێنـد، کاتێـك دەگەشـتە ئایـەتێك لەئایەتـەکانی بـەزەیی دەوسـتاو داوای بەزەیی دەکـرد و کاتێکیش دەگەشتە ئایـەتێك لەئایەتـەکانی سزا دەوەسـتاو پەنای بەخوا دەگرت.**

**١١- خوێندن بەئاوازو دەنگێکی خۆشەوە، وەك پێشتر باسمان لێوەکرد**

**١٢- وەستان لەکۆتایی ئایەتەکاندا .**

---

[٤٢] (المزمل ٤)

[٤٣] رواه أحمد وأبو داود والترمذي وابن ماجة وصححه الألباني في صحيح أبي داود (١٣٩٠) .

[٤٤] رواه أحمد وأبو داود والنسائي ، بڕوانە: (صحيح أبي داود للألباني : ٧٧٦)

**سەبارەت بەچۆنێتی قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیار کرا لە (ام سلمة) –خوای لێ ڕازیبێت– ئەویش فەرمووی:** كان يقطع قراءته آيةً آيـة {الحمد لله رب العالمين} ثم يقف { الرحمن الرحيم} ثم يقف.[45]

**واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکۆتایی ئایەتەکاندا دەوەستا. {الحمد لله رب العالمين}ی دەخوێند پاشان دەوەستا {الرحمن الرحيم}ی دەخوێندو پاشان دەوەستا.**

**١٣– کار کردن بەفەرمانەکانی قورئان و دوورکەوتنەوە لەقەدەغەکراوەکانی.**

(ابن عمر رضي الله عنه) **دەڵێت :** إنّ أحدنا ليؤتى الإيمان قبل القرآن، وتنزل السورة على محمد (ﷺ) ،فنتعلم حلالها وحرامها، وما ينبغي أن يوقف عنده منها.[46]

**واتە: هەریەکێك لەئێمە فێری خواپەرستی دەبوو پێش ئەوەی فێری قورئان بێت، کاتێك سوورەتێك بۆ محمد (ﷺ)دەهاتە خوارەوە فێری حەڵاڵ و حەرامی دەبووین و لەشوێنی پێویستدا دەوەستاین و تێدەفکراین .**

(ابن مسعود رضي الله عنه) **دەڵێت :**كان الرجل منا إذا تعلم عشر آيات لم يتجاوزهن حتى يعرف معانيهن والعمل بهنّ.[47]

**واتە: هەرپیاوێك لەئێمە دە ئایەتی لەقورئانی لەبەرکردایە بەسەریدا تێنەدەپەڕی تاوەکو مانای نەزانیبایەو کاری پێنەکردبایە.**

---

[45] أخرجه أبو داود برقم(٤٠٠١)، وأحمد في المسند ( ٦ / ٣٠٢ )، **بڕوانە:** صحيح الجامع الصغير للألباني رقم :( ٥٠٠٠ )

[46] رواه أبو جعفر النحاس في القطع والائتناف : ٨٧، والحاكم في المستدرك : ١ / ٣٥ وقال : صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي .

[47] أخرجه الطبري في التفسير وصححه ١/٧٤، ٨٣ ، والحاكم في المستدرك ١/٥٥٧ ، وصححه ووافقه الذهبي، وله شاهد عند أحمد في المسند ٥/٤١٠ وغيره .

**١٤- گویٚ گرتن و بێدەنگ بوون بۆ خوێندنەوەی قورئان .**

**خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾[48]**

**واتە: ئەگەر قورئان خوێنرا گوێی بۆ بگرن و بێدەنگ بن بەڵکو خوا بەزەیی پێتانا بێتەوە .**

**١٥- نەبچڕاندنی خوێندن مەگەر پێویست کات .**

**جابر دەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چووینە دەرەوە بۆ غەزای(ذات الرقاع)لەوێ پیاوێك ژنی یەكێك لەبێباوەڕەكان دەكوژێت، بێباوەڕەكەش سوێند دەخوات كە واز نەهێنێت تا خوێنی یەكێك لەهاوەڵانی محمد (ﷺ) نەڕژێت ،دەڕوا بەشوێنیانداو، پێغەمبەریش (ﷺ)لەشوێنێكدا دادەبەزێت و دەفەرموێت : (من رجل يكلؤنا )؟**

**واتە: كێ پاسەوانیمان دەكات؟پیاوێك لە كۆچەرەكان پیاوێكیش لەپشتیوانان هەستان و، پێغەمبەریش (ﷺ)فەرمووی : (كونا بفم الشعب ) واتە : لەبەرزاییەكەدا بن ،كاتێك گەشتنە ئەوێ : كۆچەریەكە ڕاكشاو هاوڕێكەی دەستی كرد بەنوێژ كردن، بێباوەڕەكەش هات و كاتێك زانی ئەوانن :تیرێكی تیگرت و پێكای، ئەویش تیرەكەی دەرهێناو نوێژەكەی نەبڕی تا سێ تیری لێدا ،پاشان چەمایەوەو كڕنوشی برد،پاشان هاوەڵەكەی بێدار بوویەوە، كاتێك بێباوەڕەكە دڵنیا بوو كەناسیویانەتەوە هەڵهات و، كۆچەریەكەش بەهاوڕێكەی گوت: سبحان الله بۆچی بێدارت نەكردمەوە؟**

**وتی : لەسوڕەتێكدا بووم حەزم نەكرد بیبڕم.[49]**

---

[48] (الأعراف ٢٠٤).

[49] رواه أبوداود وحسنه الألباني في صحيح أبي داود (٢٧٦/١ برقم : ١٨٢)

**١٦- كرنـــوش بـــردن لـــەكاتی خوێنـــدن یـــا بیـــستنی ئایـــەتی كرنوش(سجدە)دا.**

**أبو رافع دەڵێ: لەگەڵ (أبو هريرة ) نوێژی شێوانم كرد، (إذا السماء انشقت)ی خوێندو كرنوشی تێدا برد،منیش پێم وت : ئەم كرنوشە چییە ؟ فەرمووی : لەپشت (أبو القاسم)ەوە ئەمەم كرنوشەم بردووە، بەردەوام ئەم كرنووشە دەبەم تادەگەم بەخزمەتی.** [٥٠]

**ئەم (سجدة)یە لەنوێژو لەدەرەوەی نوێژدا فەرز نی یە بەڵكو سوننەتە، چونكە (زيد)ی كوری (ثابت)ﷺ دەڵێ : سورەتی (والنجم)م بۆ پێغەمبەر (ﷺ) خوێندو كرنووشی تێدا نەبرد.** [٥١]

**پێشەوا (عمر) یش ﷺ دەڵێ** : فمن سجد فقد أصاب ومن لم يسجد فلا إثم عليه، إن الله لم يفرض السجود إلا أن نشاء )[٥٢]

**واتە: هەر كەسێ كرنووش ببات پێكاوێتی و هەركەسێكیش كرنووش نەبات تاوانی لەسەر نییە، خوای گەورە فەرزی نەكردووە و ویستی خۆمانە،**

**وەلەسەر رای بەهێزی زانایان پێویستی بەدەست نوێژو روو لە (قبلة) كردن و سەلام دانەوە نی یە چونكە نوێژ نی یە، ئەوەشی دەڵێت نوێژە بەڵگەی بەدەستەوە نی یە.** [٥٣]

---

[٥٠] رواه البخاري [ ٧٣٤ ، ١٠٢٤ ، ١٠٢٨ ]، ومسلم ٥٧٨.

[٥١] رواه البخاري(١٠٢٣)، ومسلم (٥٧٧).

[٥٢] رواه البخاري (١٠٢٧)

٥٣ بروانە: (المحلى لإبن حزم:٥/١١١)، (تمام المنة للألباني:١/٢٧٠)، مجموع فتاوي ومقالات، بن باز:(١١/٤٠٦)

**ژمارەشیان (١٥) (سجدة) یە :**

١- الأعراف (٢٠٦)

٢- الرعد (١٥)

٣- النحل (٤٩ ، ٥٠)

٤- الإسراء (١٠٧ - ١٠٩)

٥- مريم (٥٨)

٦- الحج (١٨)

٧- الحج (٧٧)

٨- الفرقان (٦٠)

٩- النمل (٢٤ ، ٢٥)

١٠- السجدة (١٥)

١١- ص (٢٤)

١٢- فصّلت (٣٧)

١٣- النجم (٦٢)

١٤- الإنشقاق (٢١)

١٥- العلق (١٩)

# بەشی دووەم
# (الإستعاذة)
# پەنا گرتن

**خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾[54]

**واتە: هەرکە ویستت قورئان بخوێنیت ،بەر لەوە پەنا بگرە بەخوا لەشەیتانی نەفرین لێکراو.**

## شێوەکانی:

١- أعوذُ بالله من الشيطانِ الرجيم .

٢- أعوذُ بالله السّميعِ العليمِ من الشّيطانِ الرّجيم .

**خوای گەورە دەفەرموێ :**﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نزغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ]‌[55]

٣- أعوذُ بالله من الشّيطانِ الرّجيم من هَمْزِه ونَفْخِه ونَفْثِه .

٤- أعوذُ بالله السّميع العليم من الشّيطانِ الرّجيم من هَمْزِه ونَفْخِه ونَفْثِه.[56]

**(هَمْزِه) واتە : شێتی و خنکاندنی و، (نفْخِه) واتە : پۆزو خۆ بەگەورە زانینی و، (نَفْثِه) واتە : شیعرو هۆنراوەی .**

**شوێنی خوێندنی: خوێندنی (الإستعاذة) پێش خوێندنی قورئانی پیرۆزەو، بەشێکیش نیە قورئان.**

---

[54] (النحل ٩٨).

[55] [فصلت: ٣٤ -٣٦] .

[56] رواه أبو داود والترمذي وصححه الألباني في مشكاة المصابيح (١/٢٧٠) .

حوكمی (الإستعاذة): وتنی لەلای (الجمهور) زۆربەی زانایان سوننەتەو، هەندێکیش لەزانایان دەڵێن (واجب) پێویستە چونکە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾.

بەرزکردنەوەو نزم کردنەوەی دەنگ لەکاتی خوێندنی ( الإستعاذة )دا :

لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا ( الإستعاذة ) بەدەنگی بەرز دەخوێنرێت:

١- ئەگەر قورئان خوێن بەدەنگی بەرز قورئان بخوێنێت کەسێکی دیکەش گوێی لێ بگرێت .

٢- لەکاتی فێرکردن و وتنەوەی قورئانی پیرۆزدا .

٣- لەدەست پێکردنی  قورئان خوێندنی بەکۆمەڵدا .

وەلەم حاڵەتانەی خوارەوەشدا بەدەنگی نزم دەخوێنرێت:

١- لەنوێژکردندا، نوێژی تاك بێت یان بە کۆمەڵ .

٢- کەسێك تەنها  بۆ خۆی قورئان بخوێنێت، خوێندنەکە بەدەنگی بەرز بێت یا نزم .

٣-  لەکۆڕی قورئان خوێندنی بەکۆمەڵدا، بەمەرجێك یەکەم خوێنەر نەبێت.

## (البَسْمَلَة)

# ناوى خوا هێنان

تەنها یەك شێوەی هەیە كە : ( بسم الله الرحمن الرحیم )ە، وپێش قورئان خوێندنە .

حوكمی خوێندنی (بسم الله الرحمن الرحیم ) لەنێوان سورەتەكانی قورئانی پیرۆزدا :

حوكمی خوێندنی (بسم الله الرحمن الرحیم) بنیات دەنرێت لەسەر ئەو مشت و مڕەی كەلەنێو زانایاندا (ڕەحمەتی خوایان لێبێت ) هەیە سەبارەت بەوەی ئایا (بسم الله ... ) ئایەتێكە لەقورئان یان ئایەتێك نیە، ئەمەش كورتەی بۆچوونەكانیانە :

١- (بسم الله الرحمن الرحیم ) بەئایەتێك لەگشت سورەتەكان دادەنرێت تەنها سورەتی (التوبە) نەبێت، كەوابوو لەسەر ئەم ڕایە خوێندنی لەنێوان سورەتەكاندا (واجب ) پێویستە، ئەمە ڕای پێشەوا شافیعی یە ڕەحمەتی خوای لێبێت .

٢- ئایەتێكی سەربەخۆیەو بۆپیرۆزی و جیا كردنەوی سوورەتەكانە لەیەكتر، لەسەر ئەم ڕایە خوێندنی (مُستحبّ) چاكە،ئەمەش ڕای پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل و عەبدوڵڵای كوڕی ئەلموبارەك و توێژەرەوانی مەزهەبی ئەبوحەنیفەو فەرموودەناسان و شەیخولئیسلام ئیبنوتەیمییەو ئیبن بازو ئیبن عوسەیمینە ڕەحمەتی خوایان لێبێت.[٥٧]

---

[٥٧] بروانە : (مجموع الفتاوی٢٢/٤٠٦) ، تفسیر العلامة محمد العثیمین (٤/٢) ، تەفسیری ڕامان : ئەحمەد كاكە محمود ل ٦

**٣- ئایەتێکە تەنها لەسوڕەتی (الفاتحة)دا.**

**٤- ئایـەتێك نیـە لـە قورئـانی پـیرۆز، ئەمـەش ڕای پێـشەوا مالیـك و ئەبوحەنیفەیە ڕەحمەتی خوایان لێبێت.**

## تێبینی :

**١- هـەموو زانایـان یەکـدەنگن کـە (بـسم الله الـرحمن الـرحیم) بەشـە ئایەتێکە لەسوڕەتی (النمل)[٥٨] و، ئایەتیش نیە لە سوڕەتی (التوبة).**

**٢- خوێنـدنی (بـسم الله الـرحمن الـرحیم ) لـەنێوان سـوڕەتەکاندا لەریوایـەتی (حفـص) لـە (عاصـم)ەوە، (واتـە: ئـەوەی کەئـەمڕۆ دەیخوێنینەوە ) (واجب ) پێویستە.**

**شـێوازەکانی خوێنـدنی (الإسـتعاذة) و (البـسملة) لـەکاتی قورئـان خوێندندا :**

**١- جیاکردنـەوەی هەرسـێکیان (الإسـتعاذة – البـسملة – سـوڕەتەکە) لەیەکدی .**

**٢- خوێندنەوەی هەرسێکیان بەسەر یەکەوە .**

**٣- لکاندنی یەکەم (الإستعاذة) بەدووەمەوە (البسملة) و جیاکردنـەوەی دووەم لەسێیەم (سووڕەتەکە) .**

**٤- جیاکردنـەوەی یەکـەم (الإسـتعاذة) و لکانـدنی دووەم (البـسملة) بـە سوڕەتەکەوە .**

**ڕووەکـانی خوێنـدنی (البـسملة) لـەنێوان سوڕەتەکاندا جگـە لـە نێـوان (الأنفال) و (التوبة) سیانن:**

---

[٥٨] { إِنَّهُ مِنْ سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ } ﴿النمل: ٣٠﴾.

١- جیاکردنەوی هەرسێکیان لەیەکدی، واتە : وەستان لەسەر کۆتایی سوڕەتەکەو پاشان وەستان لەسەر (البسملة) و پاشان دەستپێکردن بەسوڕەتی دووەم .

٢- جیاکردنەوەی هەرسێکیان لەیەکدی.

٣- جیا کردنەوەی یەکەم و لکاندنی دووەم بەسێیەمەوە.

واتە: وەستان لەسەر کۆتایی سوڕەتی پێشوو، پاشان لکاندنی (البسملة) بەسەرەتای سوڕەتی داهاتووەوە.

بەلاَم ڕووی چوارەم دروست نیە، واتە : لکاندنی کۆتایی سوڕەتی پێشوو بە (البسملة) وەو پاشان وەستان لەسەر (البسملة)و پاشان دەستپێکردن بەسوڕەتی دووەم، چونکە شوێنی (البسملة) سەرەتای سوڕەتە نەك کۆتایی.

# بەشی سێ یەم

## مخارج الحروف

## شوێنی دەرچوونی پیتەکان

پێناسـەی مـەخرەج: بریتیـە لەشـوێنی دەرچـوونی پیتەکـە لـەکاتی دەربڕینیـدا،یا ئەوشـوێنەی کـەدەنگی پیتەکـە تێیـدا کۆتـایی دێـت و بەهۆیەوە لەپیتەکانی جودا دەبێتەوە .مەخرەجەکانیش دوو جۆرن :

- المخـــرجُ المحقَّــق : ئەو مەخرەجەیە کەپشت دەبەستێت بەبەشێکی دیـاریکراو لەبەشـەکانی (الحلـق) گـەروو یـا زمـان یـا هـەردو لێـو یـا (الخیشوم ) کەپوو.

- المخرج المقدّر : بریتیە لەو هەوایەی کەلە نێوان گەروو و دەم دایەو، کەمەخرەجی هەرسێ پیتەکانی مەددە.

### چۆنێتی دۆزینەوەی مەخرەج

بۆ دۆزینەوەی مەخرەجی هەر پیتێك لەپیتەکان (سکون) زەننەیەك بدە بەپیتەکـەو لـەپاش هەمزەیـەکی جـوولاو (متحـرّك) ەوە بیخوێنـەرەوە، لەهەر شوێنێکدا پیتەکە کۆتایی هات ئەوە مەخرەجی پیتەکەیە .

نموونـە : بۆ دۆزینـەوەی مـەخرەجی پیتـی (ب) دەڵـێین : (أَبْ)، کەواتـە مەخرەجی پیتی (ب) هەردوو لێوە.

## ژمارەی مەخرەجەکان

لەسـەر ڕای زۆرینـەی خوێنـەرانی قورئـان (جمهـور القـرّاء) مـەخرەجی پیتـەکان حەڤـدە مـەخرەجن کـەپێیان دەگوترێـت: ( مەخرەجـە تایبەتەکان)، ئەم بۆچوونەش پەسـەند کراوە لەلایـەن (خلیـل) ی کـوڕی (احمد)ی (الفراهیدي) و هەروەها (ابـن الجـزري) یـش (ڕەحمـەتی خـوای لێبێت ) لەمەتنەکەیدا دەڵێت:

مخارِجُ الحُروفِ سَبْعَةَ عَشَرْ عَلَى الّذِي يَخْتَارُهُ مَنِ اخْتَبَرْ.

جا خوێنەری بەڕێز ئەم حەڤدە مەخرەجە تایبەتانە دابەش دەبن بەسەر پێنج مەخرەجی گشتیدا که ئەمانەن:

١- (الجوف ) بۆشایی نێوان گەروو و دەم (یەك مەخرەج) .

٢- (الحلق ) گەروو (سێ مەخرەج )

٣- (اللسان ) زمان ( دە مەخرەج )

٤- (الشّفتان) هەردوو لێو (دوو مەخرەج )

٥- (الخیشوم ) کەپوو ( یەك مەخرەج )



تێبینی : پیتەکانی تجوید ئەمانەی خوارەوەن :

ء ، ب ، ت ، ث ، ج ، ح ، خ ، د ، ذ ، ر ، ز ، س ، ش ، ص ، ض ، ط ، ظ ، ع ، غ ، ف ، ق ، ل ، م ، ن ، ه ، و ، ي ، ( ـا ) ، ( ـُو ) ، (ـِي) ، (الغنّة) مینگە .

مەخرەجی یەکەم : (الجوف): بریتیە لەبۆشایی نێوان گەرو و دەم و، پیتەکانی ( مەدد ) لەخۆ دە گرێت کە ئەمانەن :

أ- (ئەلفی) زەنەدار کە پیتی پێشەوەی سەر(فَتْحَة)ی هەیە، وەکو: (قَالَ)

ب-(واو)ێکی زەنەدار کە پیتی پێشەوەی بۆر (ضمَّة)ی هەیە، وەکو: (يقُولُ)

ج- (ی)ی زەنەدار کە پیتی پێشەوەی ژێر (كَسْرة)ی هەیە، وەکو: (قِيلَ)

ئەم سێ پیتەش لە وشەی (نوحيها) کۆ بووەتەوە : ﴿ تِلْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ ﴾ [ هـود : ٤٩ ]، ئەم مەخرەجەش (تقديری) مەزەندەکراوەو شوێنێکی دیاریکراوی نیەو لەنێوان گەروو دەمدایەو کۆتایی دێت بەکۆتایی هاتنی دەنگەکە لەهەوادا، هەر لەبەر ئەمەشە کە پێیان دەگوترێت (الحروف الهوائية )پیتە هەواییەکان .

## مەخرەجی دووەم : (الحلق) گەروو

لەگەروودا سێ مەخرەج بۆ شەش پیت هەیە :

١- (اقصى الحلق) سەرووی گەروو: (کەلە سنگەوە نزیکە) و هەردوو پیتی (الهمزة : ء) و ( ه ) ی لێوە دەردەچێت، بەڵام مەخرەجی(ء) دوورترە لە مەخرەجی (ه) .






٢- (وسط الحلق) ناوەڕاستی گەروو : کەھەردوو پیتی (ع) و (ح)ی لێوە دەردەچێت ، بەڵام مەخرەجی (ع) دوورترە لە(ح) .






٣- (أدنى الحلق)خوارووی گەروو : (کەلەدەمەوە نزیکە) ) و هەردوو پیتی (غ) و (خ) ی لێوە دەردەچێت، بەلاّم مەخرەجی(خ) نزیکترە لە دەمەوە لەمەخرەجی (غ) .






## مەخرەجی سێیەم : اللسان ( زمان )

لەزماندا (دە) مەخرەج بۆ (هەژدە ) پیت هەیە :

١- (أقصى اللسان) کۆتایی زمان : (کە لە گەرووەوە نزیکە) لەگەڵ ئەوبەشەی کەبەرامبەریەتی لەئاسمانەی دەم،ئەم مەخرەجەش پیتی (ق) لێوە دەردەچێت .

٢- (أقصى اللسان) کەمێك پێش مەخرەجی (ق) لەگەڵ ئەوبەشەی بەرامبەریەتی لەئاسمانەی دەم،ئەم مەخرەجەش پیتی (ك)ی لێوە دەردەچێت، کەوابوو مەخرەجی (ك) نزیك ترە لەدەمەوە وەك لەمەخرەجی (ق) .






٣- ناوەڕاستی زمان لەگەڵ ئەو بەشەی بەرامبەریەتی لەئاسمانەی دەم، ئەم مەخرەجەش سێ پیتی لێوە دەردەچێت (ج) و (ش) و (ی).

**تێبینی :**

یەکەم: مەبەست لەپیتی(ی) لێرەدا : پیتی مەدد نەبێت،بەڵکو بزواو (متحرك) ، یا (ساكن) زەنەدار بێت و پێشەوەی (كسرة) ژێری هەبێت.

دووەم: لەکاتی دەربڕینی پیتی(ج) دا پێویستە ناوەڕاستی زمان بنوسێت بە بەشی سەرەوەی پووك، بەڵام بۆ پیتی(ش،ی) زمان نانوسێت بەپووکدا و تەنها لێ ی نزیك دەبێتەوە .

٤- یەکێك لەلێوارەکانی زمان لەگەڵ دانەخڕێکانی بەشی سەرەوە (الأضراس العليا)، کەهەستیاترین پیتەکانی زمانی عەرەبی لێوە دەردەچێت ئەویش پیتی (ض) دە، بەڵام لێواری چەپی زمان لەگەڵ دانەخڕێ کانی لاتەنیشتی زیاتر بەکار دەهێنرێت و ئاسانتریشە.



٥- یـەکێك لـەلێوارەکانی زمـان (یـا هـەردووکیان) لەگـەڵ پـووکی ددانـەکانی سـەرەوە (دوو دانـی -الـضواحك- وکەڵبـەو تەنیـشتە بـڕەڕو بڕەڕ) کە پیتی (ل) ی لێوە دەردەچێت .



**٦- پێشەوەی زمان لەگەڵ ئەو بەشەی کەبەرامبەریەتی لەپووکی دانەکانی سەرەوە، کەپیتی (ن) ی لێوە دەردەچێت .**



٧- پێشەوەی زمان وبەشێکی کەمیش لەپشتی زمان لەگەڵ ئەو بەشەی کەبەرامبەریـــەتی لـــەپووکی دانـــەکانی ســـەرەوە، پیتـــی (ر) ی لێوەدەردەچێت .






٨- پێشەوەی زمان لەگەڵ پووکی بڕەڕی سەرەوە هەرسێ پیتی (ط، د،ت)ی لێوە دەردەچن، بەڵام مەخرەجی (ط) دوورترینیانە لە بڕەڕو پاشان (د) و پاشانیش (ت) .









٩- پێشەوەی زمان لەگەڵ بەشی سەرەوەی ددانەکانی بڕەڕی خوارەوە، لەگەڵ هێشتنەوەی بۆشاییەکی تەسك بۆ ڕاکردنە دەرەوەی هەوا، ئەم مەخرەجەش هەرسێ پیتی ( س ، ص ، ز) یە .









١٠- پێشەوەی زمان و بەشی خوارەوەی بڕەڕەکانی سەرەوە کە هەرسێ پیتی ( ث ، ذ ، ظ )ی لێوە دەردەچێت.









تێبینی یەکی گرنگ : مرۆۋ خاوەنی (٣٢) ددانە :

(الثنايا) بڕەڕ: چوار ددانەکەی پێشەوە دوو لەسەرەوە و دوانیش لەخوارەوە .

(الرَباعيات) تەنیشتە بڕەڕ: ئەمیش چوار ددانە دوو لەسەرەوە و دوانیش لەخوارەوە.

(الأنياب) کەڵبە: ئەمیش چواردانە بەهەمان شێوە .

(الأضراس) ئەمیش بیست ددانەو، دەکرێت بە سێ بەشەوە :

یەکەم: (الضواحك) ئەو ددانانەی لەکاتی پێکەنیندا دەردەکەون، ژمارەیان چوار دانەیە لەدوای کەڵبەکان .

دووەم : (الطواحن) هاڕەڕ، دوازدە ددانی سەرو خوارەوەی لاشەویلگەکان، لەهەر لایەك سێ ددان .

سێیەم : (النواجذ) چوار ددانی ژیری و عاقڵی .

هەندێ لەزانایان بەهۆنراوە ڕوونیان کردۆتەوە :

للإنسان أسنان ثنايا رباعيه

وأنياب كل كالضواحك اربع

طواحن ضعف الست أربعة أخر

نواجذ فاعلمها إذ العلم أرفع




## مەخرەجی چوارەم : هەردوو لێو

ئەم مەخرەجە گشتیەش دوو مەخرەجی تایبەت بۆ چوار پیت لەخۆ دەگرێت:

١- نێوان هەردوو لێو کەئەم پیتانەی لێوە دەردەچێت :

- هەردوو پیتی (ب ، م) ئەویش بەداخستنی هەردوو لێو، بەڵام داخستنی هەردوو لێو لەپیتی (ب) دا زیاترە .


(ب)


(م)

- پیتی (و) گەر پیتی مەدد نەبێت، واتە: بزواو (متحرك) یا زەننەدار (ساكن)بێت یا پیتی پێشەوەی سەر (فتحة)دار بێت .

٢- بەشی ناوەوەی لێوی خوارەوە لەگەڵ پێشەوەی بڕەڕەكانی سەرەوە، ئەویش پیتی (ف)ی لێوە دەردەچێت .


(و)


(ف)

## مەخرەجی پێنجەم : کەپوو (الخیشوم)

کەپوو (الخیشوم) : ئەو کونەیە کەلووت دەگەیەنێت بەگەروو، ئەم مەخرەجەش مینگە (الغنّة) ی لێوە دەردەچێت .

مینگە(الغنّة) : دەنگێکی خۆشە، هاوەڵایەتی هەردوو پیتی (م ، ن ) دەکات، بەڵام مینگەی پیتی (م) لەپیتی (ن) زیاترە .

قورئان خوێنی بەڕێز، مینگەش لەڕووی بەهێزی و ڕوونییەوە دەبێت بە پێنج پلەوە :

١- ئەگەر هەردووپیتی (م،ن) (شدّة) دار بوون، وەك : (وأنّا) و(لمّا) و(آمنّا) لەم ئایەتەدا:

﴿ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَى آمَنَّا بِهِ فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴾ (الجن ١٣)

٢- ئەگەر پیتی (ن) تێهەڵکێش(إدغام) کرابێت بەمینگە، وەك ( فَمَن يُؤْمِن ) لەئایەتی پێشوودا .

٣- ئەگەر پیتی (م) و (ن) لەحاڵەتی شاردنەوە ( إخفاء ) یا هەڵگەڕاندنەوە (إقلاب ) دا بن، وەك ( كُنتُمْ بِهِ ) لەئایەتی :

﴿هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ (الصّافات ٢١).

٤- ئەگەر هەردووپیتی (م،ن) زەنەدار ( ساكن ) و ئاشکرابن .

٥- ئەگەر هەردووکیان بزواو (متحرك) بن .

کەوات مینگە سیفەتێکی وابەستەیە بەپیتی (م) و (ن)ەوە،بەڵام لەدووشێوەی کۆتاییدا دەرناکەوێت و لەهەرسێ شێوەی سەرەتادا پێویستە دەر بخرێت و ئەندازەی دوو ( حركة ) درێژ بکرێتەوە ،پشت بەخوا لە داهاتوودا باسی دەکەین.

# بەشی چوارەم

## ألقاب الحروف

## نازناوی پیتەکان

پیتـەکانی زمـانی عـەرەبی نازناویـان پێـد راوە بـەگوێرەی شـوێنی دەرچـوونیان لەدەمـەوە، یەکـەم کەسـیش نازنـاوی بـۆ پیتـەکان دانـا خـەلیلی کـوڕی ئەحمـەدی ئەلفەڕاهیـدی بـوو لەکتێبەکەیـدا بـەناوی (العين)، کەئەمانەن :

١- الحروف الجوفية الهوائية المدية : بەهەریەکێك لەسێ پیتەکەی مـەدد (ـَـا ، ـُـو ، ـِـي ) دەگوترێت .

٢- الحروف الحلقيـــة : بەهەریـەکێك لەپیتـەکانی (ء ، ه ، ع ، ح ، غ ، خ )) دەگوترێت، چونکە لەگەرووەوە دەردەچن .

٣- الحروف اللَّهَوية : بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ك ، ق ) دەگوترێت،جونکە مەخرەجیان نزیکە لەزمانە بچکۆلەوە ( اللَّهَاة ) .

٤- الحـــروف الـــشَّجْرِية : بەهەریـەکێك لەپیتـەکانی ( ج ، ش ، ض ، ي ) دەگوترێـــت، چـــونکە دراونەتـــە پـــاڵ کـــەلێنی نێـــوان هـــەردوو شەویلگەوە ( شجْر الفم ) .

٥- الحروف الذَّلْقِية : بەهەریـەکێك لەپیتـەکانی (ل ، ن ، ر) دەگوترێـت، چونکە مەخرەجیان سەری زمانە ( ذَلْق اللسان )

٦- الحروف النِّطْعيـــة : بەهەریـەکێك لەپیتـەکانی ( ط ت د ) دەگوترێـت، چـــونکە مـــەخرەجیان پێـــشەوەی ئاسمانـــەی دەم یـــا مەلاشـــوو ( نطع الحنك )ە.

٧- الحـــــــروف الأَسَـــــلِيَّة: بەهەریـەکێك لەپیتـەکانی (ص ، ز ، س) دەگوترێت،چونکە مەخرەجیان باریکایی زمانە ( أسلة اللسان ) .

٨- الحروف اللِّثَويـــة: بەهەریـەکێك لەپیتـەکانی ( ظ ، ذ ، ث ) دەگوترێت، چونکە لەنزیك پووکەوە دەردەچن .

٩- الحــــروف الـــــشفوية: بەهەریـەکێك لەپیتـەکانی (ف ، و ، ب ، م) دەگوترێت، چونکە مەخرەجیان هەردوو لێوە .

## سیفەتی پیتەکان

سیفەتی پیتـەکان: بریتیـە لەونیـشانەو تایبەتمەندیانـەی کەبەهۆیـەوە پیتەکانی پێدەناسرێتەوەو لەیەکدی جیادەکرێنەوە .

## سوودی زانینی سیفەتەکان :

١- جیاکردنـەوەی ئەوپیتانـەی کەلەمەخرەجـدا هاوبەشـن، بۆنموونـە: هەرسـێ پیتـی ( ث ، ذ ، ظ ) کـە مـەخرەجیان پێـشەوەی زمـان وبەشـی خوارەوەی بڕەڕەکانی سەرەوە .

٢- چاك دەربڕینی پیتەکان .

٣- ناسینی پیتە بەهێزو لاوازەکان .

## جۆری سیفەتەکان:

یەکەم : سیفەتە هۆگرەکان ( الصفات اللازمة ): ئەو سیفەتانەن کەبەشێکن لەپیتەکەو هەرگیز لێ ی جیا نابنەوە، ژمارەشیان لەسەر ڕای بەناوبانگی زانایان حەڤدە سیفەتە.

**دووەم : سیفەتە توشهاتووەکان (الـــصفات العارضـــة):** ئەو سیفەتانەن کەتـەواو کـەری پیتەکـەن و لەهەنـدێ حاڵـەتی دیـاریکراودا تووشـی دەبن و کاریگەرییان لەسەر خودی پیتەکە نیە لەکاتی جیابوونەوەیاندا، وەك: إخفاء و إدغام و تفخیم و هتد ...

پشت بەخوای گەورە دواتر باسیان لێوە دەکەین .

**یەکەم : سیفەتە هۆگرەکان (الصفات اللازمة)**

ئەم سیفەتانەش دەبن بەدوو بەشەوە :

١- سیفەتە دژ یەکەکان (الـــصفات المتـــضادّة): پێنج کۆمەڵەن و لەهەر کۆمەڵەیەکدا دوو سیفەتی دژبەیـەك هەیـە ئەگـەر یـەکێك لـەو دوانـە لەپیتێکدا بەدیکرا ئیدی ئەوی تریانی تێدا بەدیناکرێت. بەڵام پێویستە هەموو پیتێك یەکێکیانی تێدا بەدیبکرێت .

پێنج کۆمەڵەکەش ئەمانەن:

## الهمس والجهر

### الهمس

لە زمانەوانیدا: دەنگی نزم و ئەسپایی .

لەزاراوەشـدا: ڕێکردنـی هەناسـە لـەکاتی دەربڕینـی پیتەکـەدا، لەبـەر لاوازییان ناتوانن پشت بەمەخرەجەکانیان ببەستن.

پیتەکانی : (١٠) پیتن و ئیبنولجەزەری لەم وتەیەدا کۆی کروونەتـەوە: (فحثه شخص سکت) .

الجهر

له زمانه‌وانیدا : ده‌نگ به‌رزی .

له‌زاراوه‌شدا : ڕێنه‌کردن و گیرانی هه‌ناسه له‌کاتی ده‌ربڕینی پیته‌کاندا، له‌به‌ر به‌هێزی پشت به‌ستنی به‌مه‌خره‌جه‌که‌یه‌وه .

پیته‌کانی : نۆزده پیته‌کای تری زمانی عه‌ره‌بی ده‌گرێته‌وه ( جگه له‌پیته‌کانی الهمس) که‌له‌م وته‌یه‌دا کۆکراونه‌ته‌وه ( عَظُمَ وَزْنُ قَـارِي ذِي غَضٍّ جِدٍّ طَلَب ).

واته: پله‌و پایه‌ی به‌رزه ئه‌و قورئان خوێنه‌ی چاوی له‌حه‌ڕام ده‌پارێزێت و کۆشش ده‌کات بۆ وه‌ده‌ست هێنانی زانست .

الشدّة والرّخاوة

الشدّة

له زمانه‌وانیدا: به‌هێزی .

له‌زاراوه‌شدا : گیران یان ڕێنه‌کردنی ده‌نگ له‌کاتی ده‌ربڕینی پیته‌که‌دا له‌به‌ر ته‌واوی پشت به‌ستنی به‌مه‌خره‌جه‌وه .

پیته‌کانی: (٨) پیتن له‌م ڕسته‌یه‌دا ئیبنولجه‌زه‌ری کۆی کردوونه‌ته‌وه (أجد قط بكت) .

الرّخاوة

له زمانه‌وانیدا : نه‌رم ونیانی .

له‌زاراوه‌شدا: ڕێکردنی ده‌نگ له‌کاتی ده‌ربڕین پیته‌که‌دا .

پیته‌کانی: هه‌مو پیته‌کانی تری زمانی عه‌ره‌بی ده‌گرێته‌وه که‌ژماره‌یان (١٦) پیته:

( ث ح خ ذ ز س ش ص ض ظ غ ف هـ و ي ا )

وه‌له‌نێوان (الشدّة) و (الرّخاوة) دا سیفه‌تی مام ناوه‌ند (التوسط) یش هه‌یه‌که‌ده‌نگ تێیاندا به‌ته‌واوی ناگیرێت و به‌ته‌واویش ڕێناکات .

پیته‌کانی: (پێنج ) پیتن و له‌م ڕسته‌یه‌دا کۆکراونه‌ته‌وه : (لِنْ عُمَر) .

تێبینی : ئه‌و پیتانه‌ی که هه‌ردوو سیفه‌تی (الشدّة) و (الجهر) پێکه‌وه کۆ ده‌که‌نه‌وه شه‌ش پیتن : (قطب جد ،الهمزة)

واته: له‌کاتی ده‌ربڕینیاندا ده‌نگ و هه‌ناسه ڕاده‌گیرێت .

## الأستعلاء والإستفال

### الأستعلاء

**له زمانەوانیدا:** بەرزی .

**لەزاراوەشدا:** بەرزکردنەوەی کۆتایی زمان بەرەو ئاسمانەی دەم.

**پیتەکانی (٧) پیت و ئیبنولجەزەری لەم وتەیەدا کۆی کروونەتەوە:**

( خُصَّ ضَغطٍ قِظ )

### الإستفال

**له زمانەوانیدا:** نزمی .

**لەزاراوەشدا:** نزم کردنەوەی کۆتایی زمان لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا.

**پیتەکانی:** (بیست و دوو) پیتەکەی تری زمانی عەرەبین:

( ء ب ت ث ج ح د ذ ر ز س ش ع ف ك ل م ن ه و ي ا ) .

## الإطباق والإنفتاح

### الإطباق

**له زمانەوانیدا:** لکاندن .

**لەزاراوەشدا:** لکاندنی زۆرینەی زمان بەئاسمانەی دەمەوە لەکاتی دەربڕیندا .

**پیتەکانی :** (چوار) پیتن (ص ض ط ظ). ئەم پیتانەش بەهێز ترین و قەڵەوترین پیتن .

**تێبینی :** سیفەتی ( إطباق ) تایبەترە لە سیفەتی ( إستعلاء ) واتە هەموو پیتەکانی ( إطباق ) سیفەتی ( إستعلاء ) یان تێدایە، بەڵام مەرج نیە هەموو پیتێکی ( إستعلاء ) سیفەتی ( إطباق ) ی تێدا بێت .

## الإنفتاح

**له زمانه‌وانیدا: دوورکه‌وتنه‌وه .**

**له‌زاراوه‌شـدا: دوورخـستنه‌وه‌ی زمـان یـان زۆرینـه‌ی له‌ئاسمانـه‌ی ده‌م له‌کاتی ده‌ربڕیندا.**

**پیتـه‌کانی : (٢٥) پیته‌که‌ی تـرن (جگـه له‌پیتـه‌کانی الإطبـــاق ) که‌لـه‌م وته‌یه‌دا کۆکراوته‌ته‌وه:**

(من أخذ وجد سعة فزكا حق له شرب غيث )

## الإذلاق والإصمات

## الإذلاق

**له زمانه‌وانیدا: خێرایی و سووکی .**

**له‌زاراوه‌شـــدا: ده‌ربڕینـــی پیتـــه‌کان بـــه‌خێرایی له‌بـــه‌ر ده‌رچـــوونیان له‌پێشه‌وه‌ی زمان یان هه‌ردوو لێو.**

**پیته‌کانی : (شه‌ش) پیتن، ( ل ، ن ، ر ) مـه‌خره‌جیان پێشه‌وه‌ی زمانه‌و، (ف م ب) مه‌خره‌جیان هه‌ردوولێوه .**

**ئیبنولجه‌زه‌ریش له‌وته‌ی ( فرّ من لُبٍّ ) دا کۆی کردوونه‌ته‌وه .**

**وه‌له‌به‌ر سووکی ئه‌م پیتانه پێویسته قورئان خوێن ئاگای لیٚ یان بێت .**

الإصمات

له زمانەوانیدا : ڕێگرتن .

لەزاراوەشدا: قورس دەربڕینی پیتەکان .

پیتەکانی: (بیست و سێ) پیتەکەی ترن ، لەم وتەیەدا کۆکراونەتەوە (جز غش ساخط صيد ثقة إذ وعظه يحضك) .

واتە: لەفێڵبازو حەق نەویست خۆت بەدوور بگرەو بەشوێنی مرۆڤی خاوەن متمانەدا بکەڕێ، چونکە ئامۆژگاریەکانی هانت دەدەن بۆ چاکە کردن .

بۆیە بەم پیتانەش دەگوترێت (الإصمات) چونکەپیتەکانی له ووشەی چوار پیتی ئەسڵی و پپێنج پیتیدا بەتەنها کۆنابنەوە ، خۆ ئەگەر کۆبوونەوە ئەوا ووشەکە ئەعجەمییە( هێنراوەتە ناو زمانی عەرەبیەوە)، وەك ووشەی (عسجد) واتە : ئاڵتوون .

٢- سیفەتەبێ دژەکان

الصفير

لەزمانەوانیدا: دەنگی تیژ ، دەنگی باڵندە ، فیکە .

لەزاراوەشدا: دەنگێکە لەدەنگی باڵندە دەچێت، لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا دێتەدەرەوە .

پیتەکانی : (٣) پیتن (ص ز س ) ئەم دەنگەش لەکاتی زەنگدانەداری پیتەکاندا بەهێز ترە .

وەك: ﴿الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ﴾ (الناس ٥)

# القلقلة

**لەزمانەوانیدا : جووڵە، بزوتن .**

**لەزاراوەشدا دەرخستنی دەنگێکی بەهێز لەکاتی زەنندەداری پیتەکانیدا.**

**پیتەکانی: (٥)پیتن و ئیبنولجەزری لەم ڕستەیەکدا کۆی کردوونەتەوە ( قطب جد ) .**

**ئەم پێنج پیتە سیفەتی ( شِـدَّة ) و ( جَهـر ) یان تێدایەو نابێت لەکاتی دەربڕیندا دەنگ و هەناسە لەگەڵیاندا بێتە دەرێ،لەبەر ئەوە پێویستییان بە ( قلقلة ) دەبێت تاوەکو دەنگی پیتەکان دەرکەون .**

**بەشەکانی ( قلقلة ):**

**١- ( قلقلة ) ی گەورە : ئەگەر پیتەکە ( شَـدَّة ) دارو لەکۆتایی وشەداو لەحاڵەتی وەستان (وقف) دا بێت.**

**وەکو: ووشەی ( الحجّ) لەئایەتی** ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ قُلْ هِـيَ مَوَاقِيـتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ﴾ (البقرة ١٨٩)

الحقّ ﴿قَالُواْ الآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ﴾ (البقرة ٧١)

**٢- ( قلقلة ) ی مام ناوەند : ئەگەر پیتەکە زەنندەدارو لەکۆتایی وشەداو لەحاڵەتی وەستان (وقف) دا بێت و ( شَدَّة ) دار نەبێت.**

**وەك:** الفلقْ ، قريبْ، أحدْ، محيطْ...

**٣- ( قلقلة ) ی بچوك : ئەگەر پیتەکە زەنندەدار و لەناوەڕاست یان لەکۆتایی وشەدا بێت و لەحاڵەتی وەستان (وقف) دا نەبێت .**

**وەك :** أفتطْمعون ، صدْق ، مقْتد ، فاستجبْنا، ويدْعوننا، أستجبْ لكم.

**اللين**

لەزمانەوانیدا : ئاسانی .

لەزاراوەشدا دەرچوونی پیتەکە لەمەخرەجەکەیەوە بەئاسانی .

پیتــەکانی : دوو پــیتن (و ، ی ) کــە زەننــەدار بــن و پیّــشەوەیان ســەر (فتحة) بێت (واتە پیتی مەدد نەبن ) .

وەك : خَوْف، هَيْت، بيْت.

## الإنحراف

لەزمانەوانیدا: لادان .

لەزاراوەشدا: حەزو لادانی پیت لەمەخرەجەکەیەوە بەرەو مەخرەجی پیتێکی تر .

پیتەکانی: تەنها دوو پیتە (ل، ر)

پیتی(ل) لادانی تێدایە بەرەو پێشەوەی زمان و، پیتــی (ر) یش لادانی تێدایــە بــەرەو پــشتی زمــان و حــەزێکی کــەمیش بــەرەو مــەخرەجی پیتی(ل) .

## التفشّي

لەزمانەوانیدا: بلاّو بوونەوە.

لەزاراوەشــدا: بــلاّو بوونــەوەی هــەوا لــەناو دەمــدا لــەکاتی دەربڕینــی پیتەکەدا.

پیتەکانی: تەنها پیتی (ش)نە.

## التكرير

لەزمانەوانیدا: دووبارە بوونەوە .

لەزاراوەشدا : لەرینەوەی سەر زمان لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا .

پیتەکانی : تەنها پیتی (ر) یە .

مەبەستیش لەباسکردنی ئەم سیفەتە خۆ پاراستن و دوور کەوتنەوەیە لێی نەك جێبەجێکردنی بەتایبەت ئەگەر پیتی (ر) (شَـــدَّة) دار بوو، وەك: ﴿الرَّحْمـنِ الرَّحِيمِ﴾ (الفاتحة ٣) .

## الإستطالة

لەزمانەوانیدا: درێژ کردنەوە .

لەزاراوەشدا: درێژ کردنەوەی مەخرەج لەسەرەتایقەراخی زمانەوە تا کۆتایی بەشێوەیەك کەهەموو ئاسمانەی دەم بگرێتەوە .

پیتەکانی : تەنها پیتی (ض) ە. وەکو: (المغـــضوب) و (الـــضَّالين) و ﴿وَالضُّحَى﴾

تێبینی : نابێت هیچ کام لەپیتەکان کەمتر لەپێنج سیفەت لەسیفەتە دژبەیەکەکانی تێدا بێت و، زیاتر لەحەوت سیفەتی تێدا بێت، (پێنج لەدژەکان و دوانیش لە بێ دژەکان ) .

## سیفەتە بەهێزو بێ هێزەکان

دەتوانرێت سیفەتە لازمەکان لەڕووی بەهێزی و بێ هێزییەوە بکرێت بەسێ بەشەوە :

١- سیفەتە بەهێزەکان: ( جهر ) و ( شِدّة ) و ( إستعلاء ) و ( إطباق ) و ( قلقلة ) و ( صفير ) و ( إنحراف ) و ( تفشّي ) .

٢- سیفەتە بێ هێزەکان : (همس) و ( رخاوة ) و (إستفال) و ( إنفتاح) و (لين) و ( خفاء ) .

٣- سیفەتە ما ناوەندەکان : نێوان (شدّة ) و (رخاوة ) و ( إصمات ) و ( ذلاقة ).

### خشتەی سیفەتی پیتەکان

| پیتەکان | سیفەتەکان | | | | | | | پلەی پیتەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | |
| الهمزة | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | | | بەهێز |
| الباء | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مذلق | مقلقل | | مام ناوەند |
| التاء | مهموس | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الثاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الجيم | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | مقلقل | | بەهێز |
| الحاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الخاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الدال | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | مقلقل | | بەهێز |
| الذال | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الراء | جهري | متوسط | مستقل | منفتح | مذلق | منحرف | مكرر | مام ناوەند |

| الزاي | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | صفيري | | مـــام ناوەند |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| السين | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | صفيري | | لاواز |
| الشين | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | متفشي | | لاواز |
| الصاد | مهموس | رخوي | مستعل | مطبق | مصمت | صفيري | | بەهێز |
| الضاد | جهري | رخوي | مستعل | مطبق | مصمت | مستطيل | | بەهێز |
| الطاء | جهري | شديد | مستعل | مطبق | مصمت | مقلقل | | بـەهێز ترین پیتە |
| الظاء | جهري | رخوي | مستعل | مطبق | مصمت | | | بەهێز |
| العين | جهري | متوسط | مستفل | منفتح | مصمت | | | مـــام ناوەند |
| الغين | جهري | رخوي | مستعل | منفتح | مصمت | | | بەهێز |
| الفاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاوازترین پیت |
| القاف | جهري | شديد | مستعل | منفتح | مصمت | مقلقل | | بەهێز |
| الكاف | مهموس | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| اللام | جهري | متوسط | مستفل | منفتح | مذلق | منحرفة | | لاواز |
| الميم | جهري | متوسط | مستفل | منفتح | مذلق | | | لاواز |
| النون | جهري | متوسط | مستفل | منفتح | مذلق | | | لاواز |
| الهاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الـــواو الأصلية | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| اليـــاء الأصلية | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| پیتەكانی مەدد | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| هەردوو پیتی لین (و،ي) | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | لينان | | لاواز |

# بەشی پێنجەم

# الإدغام

# تێهەڵکێش کردن

**تێهەڵکێش کردن : بەشێوەیەکی گشتی بریتیە لەخوێندنەوەی دوو پیت بە پیتێکی ( شدّة ) دار لەکاتی دەربڕیندا.**

**بەشەکانی تێهەڵکێش کردن ( إدغام )**

**إدغام دەکرێت بەدوو بەشی سەرەکی یەوە :**

**یەکەم : تێهەڵکێش (إدغام) ی گەورە : گەیشتنی پیتێکی بزواو (متحرك) بە پیتێکی تری بزواو، بە شێوەیەك کە ببنە پیتێکی ( شدّة ) دار.**

**ئەم جۆرە تێهەڵکێشەش لەجۆری لێك چووەکان ( المتماثلين )ەولەچەند وشەیەکی کەم لەقورئانی پیرۆزدا لە ڕیوایەتی (حفص) لە (عاصم)ەوە ڕوویداوە.**

**وەك:**

- **وشەی ( تَأْمَنَّـا ) لەئایەتی ﴿قَالُواْ يَا أَبَانَا مَا لَكَ لاَ تَأْمَنَّـا عَلَى يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُ لَنَاصِحُونَ﴾(يوسف ١١) لە ئەسڵدا ( تأمنُنَا ) بووە .**
- **وشەی ( أَتُحَاجُّونِّـي ) لەئایەتی ﴿ قَالَ أَتُحَاجُّونِّـي فِي اللّهِ وَقَدْ هَدَانِ﴾ (الأنعام ٨٠) لە ئەسڵدا ( أتحاجونَني ) بووە .**
- **وشەی ( مَا مَكَّنِّي ) لەئایەتی ﴿ مَا مَكَّنِّي فيه ربِّي خيرٌ ﴾ (الكهف٩٥) لە ئەسڵدا ( ما مكَنَنِي ) بووە .**

**دووەم : تێهەڵکێشی بچوك : بریتی یە لە تێهەڵکێش کردنی پیتێکی زەنندار لەگەڵ پیتێکی بزواو (متحرك)دا بەشێوەیەك کەهەردووکیان پیتێکی ( شدّة ) دار لەڕەگەزی پیتی دووەم دروست بکەن .**

ئەویش سێ جۆری هەیە ( إدغام المتماثلين، إدغام المتقاربين، إدغام المتجانسين ) پشت بەخوا ئیستە باسیان لێوە دەکەین :

## إدغام المتماثلين

## تێهەڵکێشی پیتە لێکچووەکان

بریتی یە لەو تێهەڵکێشەی کە ڕوو دەدات لەنێوان پیتێکی زەنندار لەگەڵ هەمان پیتدا بەشێوەی بزواو، جا هەردوو پیتەکە لەیەك وشەدا کۆ ببنەوە یا لە دوو وشەدا، وەك :

- تێهەڵکێش کردنی پیتی (ت) لە (ت) دا : ﴿فَمَا رَبِحَت تِّـجَارَتُهُمْ وَمَـا كَانُواْ مُهْتَدِينَ﴾ (البقرة ١٦) کەبەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە:
رَبِحَتِّجَارَتُهُم .

- پیتی (د) لە (د) دا : ﴿وَقَـد دَّخَلُواْ بِالْكُفْرِ﴾ (المائدة ٦١) بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە : وَقَدَّخَلُوا.

- پیتی ( ذ ) لە ( ذ ) دا : ﴿وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَـبَ مُغَاضِبـاً﴾ (الأنبيـاء ٨٧) بەمشێوەیە دەخوێنرێتەوە : إِذَّهَبَ .

- پیتی ( ك ) لە ( ك ) دا : ﴿أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ الْمَـوْتُ﴾ (النسـاء ٧٨) بەمشێوەیە دەخوێنرێتەوە : يُدْرِكُّم .

-پیتی ( ل ) لە ( ل ) دا : ﴿قُـل لاَّ أَشْهَدُ﴾ (الأنعام ١٩) .

-پیتی ( ف ) لە ( ف ) دا : ﴿فَلاَ يُسْرِف فِّـي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَـانَ مَنْـصُوراً﴾ (الإسراء ٣٣)

-پیتی ( ب ) لە ( ب ) دا : ﴿اذْهَب بِّـكِتَابِي هَذَا﴾ (النمل ٢٨)

-پیتی ( م ) لە ( م ) دا : ﴿قَدْ جَاءتْكُـم مَّـوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ (یونس ٥٧)

-پیتی ( ن ) له ( ن ) دا : ﴿لَــن نَّــصْبِرَ عَلَىَ طَعَامٍ وَاحِدٍ﴾ (البقرة ٦١)
-پیتی ( و ) له ( و ) دا : ﴿حَتَّى عَفَــواْ وَّقَالُواْ﴾ (الأعراف ٩٥)

**بەلأم ئەگەر پیتی یەکەم پیتی مەدد بوو إدغام ڕوو نادات، وەك :**
- ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ طُوبَى لَهُمْ وَحُسْنُ مَآبٍ﴾ (الرعد ٢٩)
- ﴿هُوَ الَّذِي يُــرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً﴾ (الرعد ١٢)

**تێبینی : ئایەتی:** ﴿مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَــهْ * هَــلَكَ عَنِّي سُــلْطَانِيَهْ﴾ (الحاقــة **٢٨، ٢٩) بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە :**

**١- ئاشکرا کردن ( الإظهــار )، ئەویش بەوەستان( ســکتة ) لەسەر وشەی ( مَالِيَــهْ ) بێ هەناسە دان .**

**٢- تێهەڵکێش کردن ( الإدغام ) : بەم شێوەیە ( مَالِيــهَّلك )، بەلأم ڕای یەکەم بەهێز ترە .**

إدغام المتقاربين

**تێهەڵکێشی پیتە لەیەك نزیکەکان**

**بریتــی یــە لــەو تێهەڵکێشەی کەلــە بەیــەك گەیشتنی نێوان پیتــی (ل)ی زەنندەدار و (ر) ی بــزواو، یــا لــە نێــوان پــیتی (ق) ی زەننــەدار و (ك) ی بزواودا ڕوو دەدا، وەك :**
- ﴿وَقُــل رَّبِّ زِدْنِي عِلْماً﴾ (طه ١١٤)
- ﴿بَــل رَّفَعَهُ اللّهُ إِلَيْهِ﴾ (النساء ١٥٨)

**بەلأم لەئایەتی :** ﴿ كَلَّا بَــلْ ۜ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (المطففين **١٤) تێهەڵکێش ڕوو نادات چونکە وەستان** ( سكتة )

لەسەر ووشەی ( بـَـلْ ) پێویست (واجب)ە .

- ﴿أَلَمْ نَخْـلُـقكُّـم مِّن مَّاء مَّهِينٍ﴾ (المرسلات ٢٠)

وە بۆیە پێی دەوترێ (المتقاربين) چونکە ئەو دوو پیتە زەننەدارە هەم لە مەخرەج وهەم لە سیفەتیشدا زۆر لە دوو پیتە بزواوەکە نزیکن.

## إدغام المتجانسين

## تێهەڵکێشی پیتە هاوڕەگەزەکان

بریتـی یـە لەتێهەڵکێـشی پیتێکـی زەننـەدار لەگـەڵ پیتێکـی بـزواودا کەمەخرەجیان یەك بێ و لە سیفەتدا جیاوازبن، ئەو پیتانەش ئەمانەن :

١-پیتـە( نطعــي ) یـەکان : تێهـەڵکێش کردنـی پیتـی(ت) لـە( ط ) داو ( ط ) لە(ت) دا، هەروەها (ت) لە (د) داو (د) لە (ت) دا .

٢-پیتەکانی پوك ( لثة ) : تێهـەڵکێش کردنـی پیتـی ( ث ) لـە ( ذ ) داو ( ظ ) لە ( ذ ) .

٣-پیتەلێوی ( شفوي ) یەکان :بە تێهەڵکێش کردنی پیتی (ب) لە (م) دا .

نموونە :

١-تێهەڵکێش کردنی تەواوی پیتی (ت) ی زەننەدار لە ( ط ) دا :

﴿وَدَّت طَّـآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ ﴾ (آل عمران ٦٩) بە (ودطّائفة) دەخوێنرێتەوە .

﴿إِذْ هَمَّت طَّـآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلاَ﴾ (آل عمران ١٢٢)

٢- تێهەڵکێش کردنی پیتی ( ط ) ی زەننەدار لە (ت) دا :

﴿لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي﴾ (المائدة ٢٨)ناتەواوەو بە(بسطـت) دەخوێنرێتەوە، تێهەڵکێشی ناتەواوە چونکە پیتی (ط) کە نەماوە بە هەردوو سیفەتی (إستعلاء وإطباق)ی ماوە .

﴿وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِي يُوسُفَ﴾ (یوسف ٨٠)

﴿فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ﴾ (النمل ٢٢)

٣- تێهەڵکێش کردنی تەواوی پیتی (ت) ی زەننەدار لە (د) دا :

﴿فَلَمَّا أَثْقَلَت دَّعَوَا اللَّـهَ رَبَّهُمَا﴾ (الأعراف ١٨٩)، بە ( أثقَلَدَّعَوا ) دەخوێنرێتەوە .

﴿ قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا﴾ (یونس ٨٩)

١-تێهەڵکێش کردنی تەواوی پیتی (د) ی زەننەدار لە (ت) دا :

﴿قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ (البقرة٢٥٦) بە (قَتَّبَيَّن) دەخوێنرێتەوە.

﴿وَلَـكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ﴾ (المائدة ٨٩)

٢-تێهەڵکێش کردنی پیتی (ذ) ی زەننەدار لە (ظ) دا کە دوو جار لەقورئاندا هاتووە :

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ ﴾ (الزخرف ٣٩)، بە (إظّلمتم) دەخوێنرێتەوە.

﴿ وَلَن يَنفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ (النساء ٦٤)

٣- تێهەڵکێش کردنی پیتی (پ) ی زەننەدار لە (ذ) دا

﴿يَلْهَث ذَّلِكَ ﴾ (الأعراف ١٧٦)

٤- تێهەڵکێش کردنی پیتی (ب) ی زەننەدار لە (م) دا

﴿يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا﴾ (هود ٤٢)

تێبینی : لە دووخاڵی کۆتاییدا (شەشەم و حەوتەم) جگەلە (إدغام) ئاشکراکردن ( إظهار ) یش دروستەو،هەردووکیان لە (حفص) ئەویش لە (عاصم) ەوە ریوایەت کراون.

## بەشی شەشەم

### یاساکانی نونی زەننەدار و ( تنوین )

**نونی ساکن :** نونێکی زەننەداره لەهەریەك لە ناو (إسم) و کردار(فعل) و پیت (حرف) دا بەدی دەکرێت، دەنوسرێت و دەخوێنرێتەوە لەحاڵەتی وەستان (وقف) وبەردەوام بوون (وصل) یشدا .

**تنوین :** نونێکی زەننەداره، دەکەوێتە کۆتایی ناو (إسم)ەوە، نانوسرێت و تەنها لەبەیەك گەیشتنی دوو وشەدا دەخوێنرێتەوەو نیشانەی دوو سەر یا دوو ژێر یا دوو بۆری بۆ دادەنرێت .

جا لەکاتی بەیەکگەیشتنی نونی زەننەدار یا (تنوین) لەگەڵ پیتەکانی زمانی عەرەبی دا دەکرێن بە چوار حاڵەتەوە کە ئەمانەن :

**١- ئاشکراکردن ( الأظهار )**

ئاشکراکردن و دەرخستنی نونی ساکن یا (تنوین) بە بێ مینگە ( غنة ) و بێ وەستان لەسەری .

ئەم ئاشکراکردنەش لەکاتێکدایە کە نونی زەننەدار یا تەنوین لەگەڵ شەش پیت لە پیتەکانی زمانی عەرەبی بە یەك بگەن .

**پیتەکانی :** ئەو شەش پیتانە پێیان دەگوترێ پیتەکانی ئاشکراکردن ( اظهار ) یا پیتەکانی گەروو (حلق) ئەوانیش بریتین لە:

( أ ، هـ ، ع ، ح ، غ ، خ )، کە لەسەرەتای ئەم وشانەدا کۆکراونەتەوە :

أخي هاك علما حازه غير خاسر.

ئاشکرا کردنی نونی ساکن لەیەك وشەداو لەدوو وشەدا دروست دەبێت ، بەڵام ئاشکراکردنی تنوین لەدوو وشەدا نەبێت دروست نابێت.

بۆ زیاد و کەمی ئەو ئاشکراکردنە زانایـانی تەجویـد ئـەم شـەش پیتـەیان کردووە بە سێ بەشەوە، لەمەخرەجی دووەمدا باسمان لێوە کرد .

نموونە :

| ژمارە | پیت | لەگەڵ نونی ساکن | لەگەڵ تنوین |
|---|---|---|---|
| ١ | الهمزة | منْ آمن _ ينْأون . | عذابٌ أليم _ معتدٍ أثيم . |
| ٢ | الهاء | إنْ هذا _ ينْهون . | سلامٌ هي _ قومٍ هاد . |
| ٣ | العين | منْ عمل _ الأنْعام . | أجرٌ عظيم _ حكيمٌ عليم . |
| ٤ | الحاء | منْ حكيم _ تنْحتون | غفورٌ حليم _ عليماً حكيماً |
| ٥ | الغين | منْ غلٍ _ فسينْغضون . | عفوٌ غفور _ حديثٍ غيره . |
| ٦ | الخاء | منْ خير _ المنْخنقة . | لطيفٌ خبير _ يومئذٍ خاشعة |

تێبینی: بۆناسینەوەی نونی ساکن لەحالەتی ئاشکراکردندا نیشانەی (سکون) لەسەر نونەکە دانراوە، وەك : أنْعَمْتَ.

بۆ(تنوین) یش لەهەمان حاڵەتدا نیشانەی ـٌـ ـًـ ـٍـ دانراوە.

٢- تێهەڵکێش کردن ( الإدغام )

بریتیەلە بەیەکگەیشتنی نونی زەننەدار یا (تنوین) لەگەڵ شەش پیتی تری زمانی عەرەبی .

پیتـــەکانی : ( ی ، ر ، م ، ل ، و ، ن )، لـــە ووشـــەی (یرملـــون) دا کۆکراونەتەوە .

بەشەکانی ( الإدغام )

( إدغام ) دووجۆرە :

١- تێهەڵكێش كردنی مینگەدار ( إدغام بغنه )

بریتی یە لە بەیەكگەیشتنی نونی زەننەدار یا تەنوین لەگەڵ (چوار) لەو شەش پیتە كە لە ووشەی (ینمو)دا كۆدەبنەوە.

ئەمیش دووجۆرە:

أ- تێهەڵكێشی تەواوی مینگەدار ( إدغام كامل بغنة )

دوو پیتی هەیە : ( ن ، م)، ئەومینگەیەی كەماوەتەوە سیفەتە بۆ پیتی دووەم ( المدغم فيه )، بۆیە پێی دەگوترێت تێهەڵكێشی تەواو ( إدغامٌ كامل ) .

نموونە:

| پیتی إدغام | لەدوای نونی ساكن | لەدوای تنوین | مەرجی إدغام |
|---|---|---|---|
| النون<br>المیم | من نشاء<br>من مال | يومئذٍ ناعمة<br>درجاتٍ من | مەرجە لەدوو ووشەدا بێت |

ب- تێهەڵكێشی نا تەواوی مینگەدار ( إدغامٌ ناقصٌ بغنّة )

ئەمیش دوو پیتی هەیە : ( و ، ي ) بەلاّم لەم دوو پیتەدا ئەو مینگەیەی دەمێنێتەوە سیفەتە بۆ پیتی یەكەم ( المدغم )، بۆیە پێی دەگوترێت تێهەڵكێشی نا تەواو .

تێبینی: ئەندازەی درێژ كردنەوەی مینگە دوو جوڵە ( حركة ) یە، پشت بەخوا لەبەشی مەددەكاندا ڕوونی دەكەینەوە .

نموونه :

| پیتی إدغام | لەدوای نونی ساكن | لەدوای تنوین | مەرجی إدغام |
|---|---|---|---|
| الواو<br>الياء | من ورق<br>من يؤمن | بناءً وانزل<br>قومٍ يؤمنون | مەرجە لەدوو وشەدا بێت |

٢- تێهەڵكێشی بێ مینگە (إدغام بلا غنه)

بریتییە لە بەیەكگەیشتنی نونی زەننەدار یا( تنوین ) لەگەڵ دوو پیتەكەی تردا كە (ل ، ر) یە. وە لێرەدا مینگە دروست نابێ چونكە هیچ سیفەتێكی نونەكە نامێنێ.

نموونە :

| پیتی إدغام | لەدوای نونی ساكن | لەدوای تنوین | مەرجی إدغام |
|---|---|---|---|
| اللام<br>الياء | فإنْ لم<br>منْ رزق الله | سلامٌ لك<br>أخذةً رابيةً | مەرجە لەدوو وشەدا بێت |

تێبینی :

١- تێهەڵكێش كردن لەدوو ووشەدا ڕوو دەدات ، بەڵام ئەگەر لەیەك ووشەدا بوو دەبێت ئاشكرا (إظهار) بكرێت و،لەوكاتەدا پێی دەگوترێت

ئاشكرا كردنی ڕەها (إظهارٌ مطلــق ) و لەقورئاندا لەچوار شوێندا ئەوە ڕوویداوە کەئەمانەن : ( دنيا،صنوان،قنوان،بنيان ) .

٢- لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا تێهەڵکێش ڕوو نادات بەڵکو نونە زەننەدار (ساكن) ەكە ئاشكرا دەكرێت :

﴿ يس وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ ﴾ (يس ١-٢)

﴿ ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴾ (القلم ١)

٣- لە ووشەی ﴿طسم﴾ ی سورەتی ( الشعراء ) و ( القصص ) تێهەڵکێش کردنی نونی زەننەدار لە پیتی میم دا پێویستە .

٤- لەئایەتی : ﴿ وَقِيلَ مَنْ ۜ رَاقٍ ﴾ (المطففين ١٤) تێهەڵکێش ڕوو نادات چونکە وەستان( سكتة ) لەسەر ووشەی ( مَــنْ ) پێویست (واجب)ە .

٥- لەحاڵەتی وەستان (وقف) لەسەر نونی زەننەدار پێویست (واجب)ە ئاشکرا بکرێت .

## ٣- هەڵگەڕاندنەوە ( الإقلاب )

بریتی یە لە گۆڕینی نونی زەننەدار یا تەنوین بەمیمێکی شاراوە بەمینگەوە، لەکاتی گەیشتنی بە پیتی (ب) دا، ئەویش بەهێشتنەوەی بۆشاییەکی زۆر کەم لەنێوان هەردوو لێودا،لەدوای هەڵگەڕانەوەکەش درێژکردنەوەی مینگە بەئەندازەی دوو( حركة ). هەڵگەڕاندنەوە (إقلاب) لەیەك ووشەو لەدوو ووشەدەدا ڕوو دەدات.

**نموونە :**

-﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلإِ مِن بَــنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَــعْدِ مُوسَى ﴾ (البقرة ٢٤٦).

-﴿كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنــبَــتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنــبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ﴾ (البقرة ٢٦١) .

- ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنبَــاء الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيكَ﴾ (آل عمران ٤٤) .
- ﴿وَاللّهُ بَصِيــرٌ بِالْعِبَادِ﴾ (آل عمران ١٥) .
- ﴿ وَاللّهُ عَلِيمٌ بِــالظَّالِمِينَ﴾ (البقرة ٢٤٦) .
- ﴿كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعاً بِــالنَّاصِيَةِ﴾ (العلق ١٥))

**تێبینی :**

**له (مصحف) دا بۆحاڵەتی (إقلاب) ی نونی زەننەدار میمێکی بچوکی لەسەر دانراوە :** مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰٓ .

**وەبۆ (تنوین)یش: (حركـــة) یەکی لابراوەو بەدویدا میمێکی بچوك دانراوە، وەك :** وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ .

**٤- شاردنەوە ( الإخفاء )**

**بریتی یە لەخوێندنەوەی نونی زەننەدار یا تنوین لەگەڵ (پانزە) پیت لە پیتەکانی زمانی عەرەبی دا، بەشێوەیەك کە نەدەرخستن ( إظهـــار )ی تـــەواو بیـــت و نـــە تێهـــەڵکێش کـــردن(إدغـــام)ی تـــەواو بێـــت، لەگـــەڵ هێشتنەوەی مینگـە ( غنــة ) بـە ئەنـدازەی دوو جوڵـە( حركـــة ) بـۆ پیتـە شاراوەکە .**

**پیتەکانی :** ( ث ، ج ، ذ ، ز ، س ، ص ، ض ، ظ ، ف ، ش ، ط ، د ، ت ، ق ، ك )، **لە سەرەتای ووشەکانی ئەم دێرە شیعرەدا کۆکراونەتەوە:**

صف ذا ثـــنا كم جاد شخص قد ســـما دم طيبا زد فـــي تقى ضـــع ظـــالما.

**چۆنێتی شاردنەوە** (الإخفاء)

**خوێنەری بەڕێز لەکاتی دەربڕیندا دەبێت سەرەتای زوبان کەمێك لەپووکی دانەکانی سەرەوە دوور خەیتەوە.**

**تێبینی:**

**١- ئەگەر پیتی شاردنەوە (إخفـاء) لەپیتە گەورە (مفخم) ەکان بوو پێویستە شاردنەوەکەش گەورە بکرێت، وەك :**

﴿إِنَّهُ كَانَ مَنْصُوراً﴾ (الإسراء ٣٣)

**وە ئەگەر پیتەکەش بچووك (مرقق) بوو، پێویستە شاردنەوەکەش بچوك بکرێتەوە، وەك :**

﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالاً وَجَحِيماً﴾ (المزمل ١٢) .

**٢- شاردنەوە لەیەك ووشەو لەدوو ووشەدا ڕوو دەدات .**

**٣- لە (مصحف) دا بۆنونی زەنەدار لەحاڵەتی (إخفاء)دا هیچ (حركة)یەکی بۆدانەنراوەو بۆ (تنوین) یش هەردوو (حركة) کە بەشوێن یەکدا دانراون.**

**نموونە:**

| پیتەکان | لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا | پاش تنوین |
|---|---|---|---|
| الصاد | تنصروا | من صلح | ريحًا صرصرًا |
| الذال | منذرين | من ذنوبكم | سراعًا ذلك |
| الثاء | منثورا | من ثمرة | جميعًا ثمّ |
| الكاف | ينكثون | من كل | شعبًا كانوا |
| الجيم | أنجيناكم | إن جاءكم | فصبرٌ جميل |
| الشين | أنشأتم | فمن شاء | علمٍ شيئًا |

| پیتەکان | لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا | پاش تنوین |
| --- | --- | --- | --- |
| القاف | منقلب | من قبل | ثمنًا قليلاً |
| السين | تنسلون | ولئن سألتهم | عابدات سائحات |
| الدال | أندادًا | من دون | قنوانٌ دانية |
| الطاء | انطلقوا | من طيبات | صعيدًا طيبًا |
| الزاي | منزلين | من زكاها | يومئذٍ زرقًا |
| الفاء | منفكين | من فوقهم | متشابهاتٌ فأما |
| التاء | أنتم | من تحتها | جناتٍ تجري |
| الضاد | منضود | من ضل | مسجدًا ضرارًا |
| الظاء | ينظرون | من ظهير | ظلاً ظليلاً |

الإقلاب

حرف الباء

الإخفاء

ص ذ ث ك ج
ش ق س د ط
ز ف ت ض ظ

أحكام النون الساكنة والتنوين

الإظهار

ء ه خ
ع ح غ

الإدغام

ي ر م ل و ن

بغنة

ي ن م و

بلا غنة

ل ر

## بەشی حەوتەم

## یاساکانی میمی زەننەدار ( ساکن )

میمی زەننەدار لەگەڵ پیتەکانی زمانی عەرەبیدا سێ حاڵەتی هەیە :

١- **تێهەڵکێش کردنی لێوی** ( الإدغام الشفوي )

بریتی یە لە تێهەڵکێش کردنی پیتی (م)ی زەننەدار لەکاتی گەیشتنی بەمیمێکی بزواودا ، ئەم تێهەڵکێشەش ناتەواوە چونکە سیفەتی پیتەکە کە مینگەیە دەمێنێتەوە . وەتێهەڵکێشی لێکچوو ( المتماثلين ) یشی پێ دەوترێ .

**نموونە :**

﴿الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾ (قريش ٤)

﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ﴾ (الهمزة ٨)

﴿وَاللَّهُ مِن وَرَائِهِم مُّحِيطٌ﴾ (البروج ٢٠)

﴿أَلَا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ﴾ (المطففين ٤)

﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاء مَّهِينٍ﴾ (المرسلات ٢٠)

﴿فَلَمْ يَجِدُوا لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَنصَاراً﴾ (نوح ٢٥)

﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتاً﴾ (نوح ١٧)

﴿يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَاراً﴾ (نوح ١١)

﴿وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ﴾ (المعارج ٢٧)

﴿أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْراً فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ﴾(القلم ٤٦)

**٢- شاردنەوەی لێوی ( الإخفاء الشفوي )**

**بریتی یە لەشاردنەوەی میمی زەننەدار لەکاتی گەشتنی بە پیتی (ب) لەگەڵ ڕوودانی مینگە، ئەویش بە داخستنی هەردوو لێو بەهێواشی .**

**تێبینی:**

**١- زانایان دەفەرموون : ئەمە شاردنەوەیە پێویست (واجب) نی یە، بەڵکو خوێنەر سەرپشك ( مخیّر ) ە لەنێوان شاردنەوەو ئاشکراکردندا، بەڵام شاردنەوەی باشترە.**

**٢- لە( مصحف ) دا میمی زەننەداری شاراوە نیشانەی (سکون) ی بۆ دانەنراوە.**

**نموونە :**

﴿سَلْهُم أَيُّهُم بِـــذَٰلِكَ زَعِيمٌ﴾( القلم ٤٠ )

﴿فَإِذَا هُم بِـــالسَّاهِرَةِ﴾ ( النازعات ١٤ )

﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِـــمَجْنُونٍ﴾ ( التكوير ٢٢ )

﴿ثُمَّ يُقَالُ هَذَا الَّذِي كُنتُم بِـــهِ تُكَذِّبُونَ﴾ ( المطففين ١٧ )

﴿فَبَشِّرْهُم بِـــعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ( الانشقاق ٢٤ )

﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِـــمُصَيْطِرٍ﴾ ( الغاشية ٢٢ )

﴿فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِـــذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا﴾ ( الشمس ١٤ )

﴿أَلَمْ يَعْلَم بِـــأَنَّ اللَّهَ يَرَىٰ﴾ ( العلق ١٤ )

﴿إِنَّ رَبَّهُم بِـــهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ﴾ ( العاديات ١١ )

﴿تَرْمِيهِم بِـــحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ﴾ ( الفيل ٤ )

٣- **ئاشكرا كردنى ليوى** (الإظهار الشفوي)

**بريتـى يـه لەئاشـكرا كردنـى ميمـى زەننـەدار لـەكاتى گەيـشتنى بـە پيتـەكانى تـرى زمـانى عـەرەبى (جگـە لـە م ،ب )، بـە تايبـەت لەگـەڵ هەردوو پيتى (ف ، و)دا زۆر ئاشكراترە لەبەر جياكردنەوەيان لەيەكتر چونكە مەخرەجەكانيان لەيەكەوە نزيكە.**

**نموونە :**

﴿ اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِـي طُغْيَانِهِمْ يَـعْمَهُونَ﴾ (البقرة ١٥)

﴿خَتَمَ اللّهُ عَلَى قُلُوبِهمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُـمْ عَـذَابٌ عظِيمٌ﴾ (البقرة ٧)

﴿مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لاَ يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاء﴾ (ابراهيم ٤٣)

| پيتەكان | لەيەك وشەدا | لەدوو وشەدا |
|---|---|---|
| الهمزة | الظمآن | عليكم أنفسكم |
| التاء | أمتا | أم تأمرهم |
| الثاء | أمثالكم | مرجعكم ثمَّ |
| الجيم | – | وما جعلناهم جسدًا |
| الحاء | يمحق | أم حسبت |
| الخاء | – | أم خلقوا |
| الدال | وأمددناهم | عليهم دائرة السوء |
| الذال | – | واتبعتهم ذريتهم |
| الراء | أمرا | ربكم رب السماوات |
| الزاي | رمزا | أم زاغت |
| السين | تمسون | فوقكم سبع طرائق |

| پیتەکان | لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا |
|---|---|---|
| الشين | أمشاج | لهم شراب من حميم |
| الصاد | – | وهم صاغرون |
| الضاد | وامضوا | ألفوا آباءهم ضالين |
| الطاء | وأمطرنا | مسهم طائف |
| الظاء | – | وهم ظالمون |
| العين | أمعاءهم | هم عن اللغو |
| الغين | – | فإنهم غير ملومين |
| الفاء | – | وهم فرحون |
| القاف | – | بل هم قوم يعدلون |
| الكاف | يمكث | إليكم كتابًا |
| اللام | وأملى | أم لهم |
| النون | تمنى | مستهم نفحة |
| الهاء | يمهدون | برهانكم هذا |
| الواو | أموات | حسابهم وهم |
| الياء | عميًا | أم يريدون |

**تێبینی :**

**بۆحاڵەتی ئاشکرا کردنی میمی زەننەدار لە (مصحف) ی پیرۆزدا سەرە پیتی (ح) ی بۆدانراوە، وەك :** وَٱلشَّمۡسَ .



## حوكمی میم و نونی ( شدّة ) دار

دەرخستنی مینگە ( الغنّة ) لەكاتی دەربڕینی میم و نونی ( شـــدّة ) داردا پێویست (واجب)ە، با لەیەك ووشەشدا بێت.

نموونە بۆ نونی ( شدّة ) دار : ( إنّ ، الجنّة ، النّاس )

نموونە بۆ میمی ( شدّة ) دار : ( المزّمّل ، محمّد ، أمّا ، ثمّ )

## بەشی هەشتەم

### لامی ناساندن ( لام التعريف )

**لامی ناساندن دوو جۆری هەیە :**

**١- لامی ( قمـــري ): ئەو لامە زەنگنەدارەیە لەپێش یەکێك لەچواردە پیتە( قمري )ەکانەوە دێت و دەنووسرێت و ئاشکرا دەکرێت.**

**پیتە ( قمري )ەکانیش ئەمانەن : (أ ، ب ، غ ، ح ، ج ، ك ، و ، خ ، ف ، ع، ق، ی ، م ، ه) کەلە ڕستەیەکدا کۆکراونەتەوە :**

( أبغ حجك وخف عقيمه ) .

**نموونە :**

| پیتەکان | نموونە | پیتەکان | نموونە |
|---|---|---|---|
| ء | الأرض | خ | الخلق |
| ب | البحر | ف | الفتح |
| غ | الغفور | ع | العاديات |
| ح | الحي | ق | القوي |
| ج | ذو الجلال | ي | اليمين |
| ك | الكبير | م | المؤمنون |
| و | الوارثون | هـ | الهدى |

٢- لامی ( شمسي ) : ئەو لامە زەننەدارەیە لەپێش یەکێك لەچواردە پیتە ( شمـــشي )ەکانـەوە دێـت و دەنووسـرێت و ناخوێنرێتـەوە ، بـەڵکو تێهـەڵکێش (إدغام) دەکرێـت لـە پیتـە ( شمـــشي )ەکـەدا بـەبێ مینگـە تەنها پیتی (ن) نەبێت مینگەی هەیە.

پیتە( شمشي )ەکانیش ئەمانـەن : ( ط ، ث ، ص ، ر ، ت ، ض ، ذ ، ن ، د ، س ، ظ ، ز ، ش ، ل ) لەسەرەتای ئەم ووشانەدا کۆکراونەتەوە:

طِبْ ثُمَّ صِلْ رَحْمَاً تَفُزْ ضِفْ ذَا نِعَم      دَعْ سُوءَ ظَنٍ زُرْ شَرِيفَاً لِلْكَرَم

نموونە:

| پیتەکان | نموونە | پیتەکان | نموونە |
| --- | --- | --- | --- |
| ط | الطيب | ن | النعيم |
| ث | الثواب | د | الدنيا |
| ص | الصبر | س | السائلين |
| ر | الرقيب | ظ | الظالمين |
| ت | التائبون | ز | الزاجرات |
| ض | الضلال | ش | الشاكرين |
| ذ | الذاكرين | ل | الليل |

## گەورە كردن و بچووك كردن ( التفخيم والترقيق )

پیتەكانی زمانی عەرەبی لەڕووی گەورەو بچووكی (تفخیم و ترقیق) ەوە دەكرێن بەسێ بەشەوە :

١- ئەو پیتانەی هەمیشە بەگەورە ( مفخّم )ی دەخوێنرێنەوە، ئەوانیش بریتین لەپیتەكانی ( إستعلاء : خص ضغط قظ ) بەتایبەت پیتەكانی ( إطباق: ص ض ط ظ ).

ئەم پیتانەش چوار پلەیان هەیە، لەبەهێزەوە ڕیزبەند كراون:

پلەی یەكەم: ئەگەر سەر ( فتحـــة ) یان ببێ و بەدوایاندا پیتی ئەلیف ( الألف ) هاتبێ.

وەك: ﴿وَلاَ الضَّالِّينَ﴾ (الفاتحة ٧) ، ﴿حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ﴾ (التكاثر ٢) ، ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ﴾ (الطارق ٢) .

پلەی دووەم : ئەگەر سەر ( فتحـــة ) یان ببێ و بەدوایاندا پیتی ئەلیف ( الألف ) نەهاتبێ.

وەك: ﴿ اللَّهُ الصَّمَدُ﴾ (الإخلاص ٢) ، ﴿ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ﴾ (الفلق ٢) .

پلەی سێ یەم: ئەگەر بۆر ( ضمة ) یان هەبێت .

وەك: ﴿ غُلِبَتِ الرُّومُ﴾ (الروم ٢) ، ﴿فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ (المنافقون ٣)

پلەی چوارەم: ئەگەر ژێر ( كسـرة ) یان هەبوو .

وەك: ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ﴾ (المرسلات ٤١) ، ﴿ اهـــدِنَا الـــصِّرَاطَ المُستَقِيمَ﴾ (الفاتحة ٦)

بەڵام ئەگەر پیتە( مفخّم )ەكە:

- زەننەدارو پیتی پێشەوەی سەر ( فتحـــة )ی هەبوو، ئەوە لەپلەی دووەمدایە. وەك: ﴿يَتِيماً ذَا مَقْرَبَةٍ﴾ (البلد ١٥)

- زەننەدارو پیتی پێشەوەی بۆر (ضمة ) ی هەبوو لەپلەی سێیەمدایە.
وەك: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ﴾ (الفجر ٢٧)

- زەننەدارو پیتی پێشەوەی ژێر (كسرة)ی هەبوو لەپلەی چوارەمدایە
وەك: ﴿وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجاً﴾ (نوح ١٨)

٢- ئەو پیتانەی کە هەمیشە بە بەبچووك (مرقــق )ی دەخوێنرێنـەوە، ئەمانەن: (ج ح د ذ ز س ش ع ف ك م ن هـــ و ي).

٣- ئەوپیتانـەی هەنـدێ جـار بەگـەورە و هەنـدێ جـاریش بـە بـچووك دەخوێنرێنەوە، ئەمانەن:
((ر ، ل ، الألف ، مینگـەی شـاردنەوە: غنـــة الإخفـــاء ))، پـشت بەخوای گەورە لێرەدا باسیان دەكەین:

## پیتی (ر)

پیتی (ر) سێ حاڵەتی هەیە چونکە جاری واهەیە بەگەورەو جاری واش هەیە بەبچووك و جاری واش هەیە بەهەردوو حاڵەتەکە دەخوێنرێتەوە :

پیتی (ر) لەحاڵەتی گەورەیی ( تفخیم)دا :

١- ئەگەر خۆی سەر (فتحة ) ی هەبوو.

وەك: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ﴾ (الفيل ١)

٢- ئەگەر بۆر (ضمة )ی هەبوو .

وەك: ﴿ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقاً قَالُواْ هَـذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً﴾ (البقرة ٢٥) .

٣- ئەگەر خۆی زەنندەدار بێ بەلاَم پیتی پێشەوەی بۆر (ضمة ) یا سەر (فتحة ) ی هەبێ .

وەك: ﴿وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفاً * فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفاً * وَالنَّاشِرَاتِ نَشْراً * فَالْفَارِقَاتِ فَرْقاً﴾ (المرسلات ١-٤) ﴿فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ﴾ (الغاشية ١٣) .

٤- ئەگەر خۆی زەنندەی هەبێ و پیتی پێشەوەی ژێر (كسرة )ی (أصلي ) هەبێت بەلاَم پیتی دواوەی یەکێك بێت لەپیتەکانی (إستعلاء : خص ضغط قظ ) بێت .

وەك: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾ (الفجر ١٤) .

﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَاباً فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ (الأنعام ٧)

٥- ئەگەر خۆی زەنندەی هەبێ و پیتی پێشەوەی ژێر (كسرة )بێت بەلاَم ژێرەکە (أصلي ) نەبێ بەڵکو توش هاتوو( عارض ) بێت.

وەك:

﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى﴾ (الأنبياء ٢٨) .

﴿أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ارْتَابُوا﴾ (النور ٥٠) .

﴿ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً﴾ (الفجر ٢٨) .

٦- ئەگەر خۆی زەنەی (عارض)ی هەبوو واتە لە سەری وەستا بووی، بەلاّم پیتی پێشەوەی زەنەی هەبیٚ وپیتی (ي) نەبێت وەپیتی پێشتری ئەویش بۆر یا سەری هەبیٚ .

وەك: ﴿وَالْفَجْرِ * وَلَيَالٍ عَشْرٍ * وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ﴾ (الفجر ١-٤) .

**پیتی (ر) لەحاڵەتی بچووکی ( ترقیق) دا :**

١- ئەگەر خۆی ژێری هەبیٚ.

وەکو: ﴿إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاء وَالصَّيْفِ﴾ (قريش ٢)، ﴿ الْقَارِعَةُ﴾ (القارعة ١)

٢- ئەگەر خۆی زەنەی هەبیٚ و پیتی پێشەوەی ژێر (کسرة) ی (اصلي) بیٚ و لەیەك وشەدا بێت، وە لە دوایەوە پیتێك لەپیتەکانی (استعلاء) نەبیٚ وەکو:

﴿فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ﴾(البروج ١٨)،﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً﴾(المائدة ٤٨)

﴿أَلَا إِنَّهُمْ فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَاء رَبِّهِمْ﴾ (فصلت ٥٤)

٣- ئەگەر خۆی زەنەی بەهۆی وەستان (وقف) ەوە هەبیٚ و لەپاش (ی) یەکی زەنەدارەوە هاتبێت، جائەو (ی) یە پیتی مەدد بێت وەکو: ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (التغابن ٢) ، ﴿إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ﴾ (العاديات ١١)

یا پیتی (لین) بێت، وەکو:

﴿وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّـيْرَ﴾ (سبا ١٨)

﴿فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى الْخَـيْرِ﴾(الاحزاب ١٩)

٤- ئەگەر لەکۆتایی ووشەیەکدا زەننەی هەبوو ، پیتی پێشەوەیشی ژێر( کسرة )ی ( أصلي ) هەبوو وە بە دوایدا لەووشەیەکی تردا پیتێکی ( إســـتعلاء ) هاتبوو، ئەم حاڵەتەش سێجار لەقورئانی پیرۆزدا ڕوویداوە:

﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ ﴾ (لقمان١٨)

﴿فاصبِرْ صَبرا جميلا﴾ (المعارج ٥)

﴿ أَنْذِرْ قَوْمَكَ ﴾ (نوح ١)

٥- ئەگەر زەننەی هەبوو بەهۆی وەستان (وقف)ەوە وبەدوای پیتێکی زەننەداریشدا هاتبوو جگە لەپیتەکانی ( إســـتعلاء ) و پێش پیتە زەننەدارەکەش ژێر ( کسرة )ی هەبوو .

وەکو: ﴿إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَا وَمَا أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ السِّحْرِ﴾ (طه ٧٣)

﴿ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ﴾ (ص ١)

٦- ئەگەر دوای (ر) پیتێکی لارکراو ( مُمـــال ) هەبوو، ئەم حاڵەتەش لەقورئانی پیرۆزدا یەك جار ڕوویداوە :

﴿وَقَالَ ارْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ اللّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا﴾ (هود ٤١)

پیتی ( ر ) لەنێوان هەردوو حاڵەتی گەورە یی( تفخیم )و بچووکی ( ترقیق ) دا ( جائز الوجهین )

١- ئەگەر خۆی زەننەو پیتی پێشەوەیشی ژێرا( کسرٌ أصلي ) بێ و گەیشتبێت بە پیتی ( استعلاء ) بەمەرجێك ژێردار بێ .

وەکو: ﴿فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ﴾ (الشعراء ٦٣) بەلاّم خوێندنەوەی بە بچووکی چاکترە .

٢- ئەگەر خۆی زەننەی هەبوو بەهۆی وەستانەوە لە دوای پیتێکی زەننەداری ( استعلاء ) هاتبێ و ئەویش لە دوای پیتێکی ژێردار هاتبێ. وەکو:

- ﴿ادْخُلُواْ مِصْرَ﴾ (یوسف ٩٩)، لێرەدا هەردوو حاڵەتەکە دروستە بەلاّم خوێندنەوەی بە گەورەیی چاکترە، چونکە لەحاڵەتی (وصل)دا سەر ( فتحة ) دارە .

- ﴿وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ﴾ (سبأ ١٢) لێرەشدا بەهەمان شێوە بەلاّم بەبچووکی باشترە، چونکە لەحاڵەتی (وصل)دا ژێر( کسرة ) دارە، هەروەها ئەم سێ نموونەیەی تریش :

- ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ (القمر ١٦)

- ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ﴾ (الفجر ٤)

- ﴿فَأَسْرِ﴾ و﴿أَنْ أَسْرِ﴾

## پیتی (ل)

پیتی (ل) لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا بەگەورەیی دەخوێنرێتەوە :

١- لامیووشەی پیرۆزی (الله) ئەگەر سەر( فتحـــة )ی لەپێشەوە بوو یا هەر خۆی لەسەرەتاوە هاتبوو .

وەکو :

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ (الإخلاص ١) ﴿اللَّهُ الصَّمَدُ﴾ (الإخلاص ٢)

٢- لامی ووشەی پیرۆزی (الله) ئەگەر بۆر( ضمة )ی لەپێشەوە بوو.

وەکو: ﴿نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ﴾ (الهمزة ٦)

٣- ئەگەر زەننەی لەپێشەوە بوو پێش زەننەکەش سەر( فتحة ) بوو.

وەکو: ﴿وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطاً﴾ (الجن ٤)

٤- ئەگەر زەننەی لەپێشەوە بوو پێش زەننەکەش بۆر( ضمة ) بوو.

وەکو: ﴿أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ﴾ (نوح ٣) .

وە لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا بەبچوکی دەخوێنرێتەوە :

١- لامی وشەی پیرۆزی (الله) ئەگەر ژێر ( کسرة )ی ( أصـــلي ) لەپێشەوە بوو. وەکو : ﴿قُلِ اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ (الزمر ٤٦)

﴿وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللَّهِ﴾ (الأنفال ١٠)

٢- ئەگەر ژێر( کسرة )یەکی توش هاتووی لەپێشەوە بوو.

وەکو: ﴿ لِمَ تَعِظُونَ قَوْماً اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ ﴾(الأعراف ١٦٤) چونکە (قَوْماً اللَّهُ) بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: (قَوْمَنِ الله) .

٣- ئەگەر زەننەی لەپێشەوە بوو پێش زەننەکەش ژێر ( کسرة ) هەبوو.

وەکو: ﴿وَيُنَجِّي اللَّهُ الَّذِينَ اتَّقَوا بِمَفَازَتِهِمْ﴾ (الزمر ٦١)

٤- لەهەمووکاتێکی قسەکردندا چونکە پیتی (ل) یەکێکە لەپیتە بچووکەکان .

بۆ نموونە: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ﴾ (العنكبوت ٤٦)، ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ (الملك ١٥)

## پیتی (الألف)

پیتی (الألف) پێش پیتی خۆیان دەکەون لەکاتی خوێندنەوەدا.

ئەگەر لە پێشیەوە پیتێکی گەورە هاتبوو ئەوا بە گەورەیی دەخوێنرێتەوە وەکو:

- ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ﴾ (القارعة ٣)
- ﴿وَاللَّهُ مِن وَرَائِهِم مُّحِيطٌ﴾ (البروج ٢٠)
- ﴿وَلاَ الضَّالِّينَ﴾ (الفاتحة ٧)

وەئەگەریش لەپێشیەوە پیتێکی بچووك هاتبوو ئەوا بە بچووکی دەخوێنرێتەوە .

- ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ﴾ (التكاثر ١)
- ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَاداً﴾ (النبأ ٧)
- ﴿وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ﴾ (الكافرون ٤)

## مینگەی شاردنەوە ( غنّة الإخفاء )

ئـەم مینگەیـەش شـوێنی پیتـی پـاش خـۆی دەکـەوێت لـەکاتی خوێندنەوەدا. ئەگەر بەدوای مینگەکەدا پیتێکی گەورە هاتبوو ئەوا بە گەورەیی دەخوێنرێتەوە وەکو :

- ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ﴾ (الشرح ٧)
- ﴿هَذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ﴾ (المرسلات ٣٥)
- ﴿وَإِذَا انقَلَبُواْ إِلَى أَهْلِهِمُ انقَلَبُواْ فَكِهِينَ﴾ (المطففين ٣١)

وە ئەگەر بەدوای مینگەکەداپیتێکی بچووك هاتبوو ئەوا بە بچووکی دەخوێنرێتەوە وەکو :

- ﴿وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ﴾ (الشرح ٢)
- ﴿إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَاهَا﴾ (النازعات ٤٥)
- ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ﴾ (العصر ٢)

## بەشی نۆیەم

## مەددو بەشەکانی

مەدد : بریتیە لەدرێژ کردنەوەی دەنگ بەیەکێك لەپیتەکانی مەدد یا یەکێك لەپیتەکانی (اللین).

پیتەکانی مەدد : (الف) ی زەننەدار پیتی پێشەوەی سەر( فتحة ) بێ.

( ي ) ی زەننەدار پیتی پێشەوەی ژێر ( كَسْرَة ) بێ.

( و ) ی زەننەدار پیتی پێشەوەی بۆر ( ضَمَّة )بێ.

کەهەر سێکیان لە ووشەی ( نُـوحِـيهَـا ) کۆکراونەتەوە.

پیتەکانی (لین) : (و) ی زەننەدار پیتی پێشەوەی سەر ( فتحة )بێ.

( ي )ی زەننەدار پیتی پێشەوەی سەر ( فتحة ) بێ.

جیاوازی نێوان پیتی مەددو پیتی (الهمزة)

| ڕووی بەراورد | (الهمزة) | پیتەکانی مەدد |
|---|---|---|
| لەڕووی مەخرەجەوە | مەخرەجی ( همزة ) کۆتایی گەرووە. | مەخرەجی پیتەکانی (لین ) بۆشایی ناو دەم(جوف)ە . |
| لەڕووی بەهێزی لاوازیەوە | پیتێکی بەهێزە | لاوازن |
| لەڕووی شێوەیانەوە | پیتێکی ( حركة ) دارە | ( حركة ) یان نیە |
| لەڕووی بنەڕەتی لاوەکی یەوە | پیتێکی (أصلي) یە | پیتی ( فرعي ) ین |

**بەشەكانی مەدد**

**مەدد دەكرێت بەدوو بەشی سەرەكی یەوە :**

**١- مەددی بنەڕەتی ( المـد الأصـلي ) : بریتیە لەسێ پیتەكەی مەدد بەمەرجێك بەدوایاندا پیتی (همزە) یا زەننە(سكون) نەهاتبێت، ئەندازەی درێژ كردنەوەشی دوو جوڵە ( حركة )یە، هەروەها پێشی دەوترێ مەددی ئاسایی ( طبیعي ) چونكە هەموو دەم و زمانێكی ساغ زیاترو كەمتر لەو ئەندازەیە درێژی ناكاتەوە.**

**ئەندازەی دوو( حركة )ش ئەوەندەیە كەبەخێراییەكی مام ناوەند پەنجەت دابخەیت و بیكەیتەوە، یائەندازەی وتنی دووپیت**

**بەشوێن یەكدا ( قَ قَ ) .**

**مەددی ئاسایی دەكرێت بە(چوار) بەشەوە :**

**ا- مەددی ئاسایی لەكاتی وەستان و بەردەوام بووندا ( المد الطبیعي الثابت وصلا ووقفا).**

**ئەگەر دوای پیتی مەدد پیتێكی بزواو(متحرك) لەحاڵەتی وەستان (وقف)و بەردەوام بوون (وصل)دا هاتبێت.**

**وەكو: ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ﴾ (التكاثر ١) هەردووپیتی ( ك )و( ث ) بەدوای (ا) دا هاتوون و لەوەستان ونەوەستاند بزواون .**

﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْماً كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيراً﴾ (الإنسان ٧)

﴿ فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ﴾ (البينة ٣) .

﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ * فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ﴾ (القارعة ٦-٧)

**ب- مەددی ئاسایی تەنها لەكاتی وەستاندا ( المد الطبیعي الثابت في الوقف دون الوصل).**

ئەم جۆرەیان تەنها لەحاڵەتی وەستان (وقف)دا پەیدا دەبێت، ئەویش لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا :

١- بەدوای پیتی مەددا لە ووشەیەکی تردا پیتێکی زەننەدار بێت. وەکو:

﴿ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ﴾ (المطففين ١٦) .

﴿وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ﴾ (الفجر ١٠) یاء (ذِي)

﴿فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ (النساء ١٧٦)

ئەگەر لەسەر ووشەی ( لَصَالُوا ) و ( ذِي ) و ( كَانَتَا ) و ( فَلَهُمَا ) بوەستی دەبێتە مەددی ئاسایی.

٢- وەستان لەسەر ناوێکی ( مقصور ) کە (تنوين)ی ( فتحة ) ی لەسەر بێ. وەکو:

﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة ٢) ، ﴿ هَذَا هُدًى﴾ (الجاثية ١١) ، (ضُحًى) (الأعراف ٩٨)، (قُرًى) (الحشر ١٤)، (طُوًى) (النازعات ١٦).

٣- وەستان لەسەر پیتی (ألف) کە (تنوين)ی ( فتحة )ی لەسەر بێ. وەکو: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيماً حَكِيماً﴾ (الانسان ٣٠)، بەوەستان لەسەر ( عَلِيماً ) یا ( حَكِيماً )، ئەم جۆرە مەددەش پێی دەگوترێت مەددی گۆڕاو ( العوض )

٤- ئەگەر پیتی مەددەکە لەبنەڕەتدا نون بووبێت بەلام بە (تنوين) نوسرابێت. وەکو :

وشەی (لَنَسْفَعاً) لەئایەتی ﴿كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ﴾ (العلق ١٥) .

٥- ئەگەر پیتی مەددەکە پیتی (ألف) بوو لەم (حەوت) ووشەیەی خوارەوەدا:

- (أَنَا) لەئایەتی ﴿ وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴾ (الكافرون ٤)

- (لَّكِنَّا) لەئایەتی ﴿ لَّكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا ﴾ (الكهف ٣٨)

- (الظُّنُونَا) لەئایەتی ﴿وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا﴾ (الأحزاب ١٠)
- (الرَّسُولَا) لەئایەتی ﴿ يَقُولُونَ يَالَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا ﴾(الأحزاب ٦٦)
- (السَّبِيلَا) لەئایەتی ﴿ وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا ﴾ (الأحزاب ٦٧)
- (قَوَارِيرَا) لەئایەتی ﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا﴾ (الانسان ١٥)
بەڵام وشەی (قوارير)ی سورەتی (النمل ١٦) ناگرێتەوە چونکە پیتی ئەلیفی پێوە نیە .

- (سَلَاسِلَا) لەئایەتی ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَا وَأَغْلَالاً وَسَعِيراً﴾(الانسان ٤)
لەکاتی وەستان لەسەر وشەی ( سَلَاسِلَا )دەشتوانی ئەلیفەکەی لاببەیت و لەسەر پیتی لام بوەستی، بەڵام لەحاڵەتی نەوەستاندا (وصل) دا دەبێت ئەلیفەکە نەخوێنرێتەوە.

تێبینی: لە(مصحف)ی پیرۆزدا ژمارە پێنج بەبچوکی لەسەر ئەلیفی ئەم حەوت وشەیە دانراوە، واتە نەخوێندنەوەیان لەکاتی ( وصل)دا.

ج-مەددی ئاسایی تەنها لەکاتی بەردەوام بوون (وصل)دا ( المد الطبيعي الثابت في الوصل دون الوقف).
واتە: جێگیر بوونی مەددی ئاسایی لەحاڵەتی بەردەوام بوون لەسەر خوێندن (وصل)دا، ئەمیش لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا :

١- مەددی ( الصلة الصغرى ) : ئەو ڕاناوە بزواوەیە کەبۆ تاکێکی ئامادە نەبووی نێر بەکاردێت و دەکەوێتە کۆتایی ووشەوە لە نێوان دوو پیتی بزواودا بەمەرجێك بەدوایدا پیتی ( همزة ) نەیەت.

وەکو :

﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحَدٌ﴾ (الإخلاص ٤)، بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: (هو كفوا) ﴿فَأَثَرْنَ بِهِ نَقْعاً * فَوَسَطْنَ بِهِ جَمْعاً﴾ (العاديات ٤-٥) بە (بهي نقعا)و(بهي جمعا) دەخوێنرێتەوە.

﴿إِنَّهُ كَانَ فِي أَهْلِهِ مَسْرُوراً﴾ (الانشقاق ١٣)، بە (إِنَّهُو) و(أَهْلِهِي) دەخوێنرێتەوە. ئەندازەکەشی دوو جوڵە (حركة) درێژ دەکرێتەوە لەحاڵەتی بەردەوام بوون (وصل)دا.

٢- ئەگەر پیتی مەدد کەوتە پێش پیتی کۆتاییەوە ئەوا دەبێتە مەددێکی ئاسایی لەکاتی بەردەوام بوون (وصل) دا، بەلاّم لەحاڵەتی وەستان (وقف) دا دەبێتە مەددی توش هاتوو بەزەننە( المد العارض للسكون). وەکو:

﴿إِنَّهُ بِعِبَادِهِ خَبِيرٌ بَصِيرٌ﴾ (الشورى ٢٧) لەکاتی (وصل) کردنی (خَبِيرٌ) و وەستان لەسەر (بَصِيرٌ).

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ (ابراهيم ٥) بە (وصل) کردنی (صَبَّارٍ) دەبێتە مەددێکی ئاسایی.

د-مەددی ئاسایی پیتیی لە سەرەتای هەندێ لەسوڕەتەکان (المد الطبيعي الحرفي في هجاء فواتح بعض السور).

ئەوپیتانەی لەسەرەتای سوڕەتەکاندا هاتوون (چواردە) پیتن لەم ڕستەیەدا کۆکراونەتەوە: (نصّ حكيم قاطع له سر)

کەدەکرێن بەچەند بەشێکەوە:

١- دووپیتیەکان، ژمارەیان (پێنج )پیتەو لەم ڕستەیەدا کۆکراونەتەوە: (حي طهر )، وەبەم شێوەیە دەخوێنرێنەوە:

( حا، يا، طا، ها، را ).

٢- ئەو سێ پیتی یانەی کەناوەڕاستیان پیتی مەددە، کەژمارەیان (حەوت) پیتەو لەم ڕستەیەدا کۆکراونەتەوە: (سنقص لكــم)، وەبەم شێوەیە دەخوێنرێنەوە : سین، نون، قاف، صاد، لام، کاف، میم.

٣- ئەو سێ پیتی یانەی کەناوەڕاستیان پیتی (لین)ە، تەنها پیتی (ع)ەو، بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە : عێن .

٤- ئەو سێ پیتی یانەی کەناوەڕاستیان پیتی مەددو (لین) نیە، تەنها پیت (أِلــــف)ە، بەلاّم تەنها جۆری یەکەمیان مەددی ئاسایی (طبيعي)ەو دوو جوڵە (حركة) درێژ دەکرێتەوە، وەکو:

﴿حم﴾، پیتی( ح ) دوو جوڵە درێژ دەکرێتەوە .

﴿كهيعص﴾ (مريم ١) ، پیتی(هـ ) و( ي ) دوو جوڵە درێژ دەکرێنەوە.

﴿طه﴾ (طه ١) ، پیتی( ط ) و ( هـ ) دوو جوڵە درێژ دەکرێنەوە.

﴿الر﴾ پیتی (ر) هەروەها دوو جوڵە درێژ دەکرێتەوە.

بەلاّم پیتەکانی بەشی دووەم و سێ یەم مەددی لاوەکی (فرعــي)ن و دواتر باسیان لێوە دەکەین .

وە لەبەشی چوارەمیشدا هیچ جۆرە مەددێك نیە. وەکو : ﴿الــر﴾ کە بە (ألِف) دەخوێنرێتەوە.



٢- مەددی لاوەکی (المــد الفرعــي ): بریتی یە لەو درێژ کردنەوەیەی کەلەئەنجامی بەیەککەیشتنی پیتەکانی مەدد لەگەڵ پیتی (همزة : ء) یا پیتێکی زەنندار.

جۆرەکانی مەددی لاوەکی (المد الفرعي ):

أ- ئەو مەددانەی بەهۆی (همزة) وە ڕوو دەدەن.

ب- ئەو مەددانەی به هۆی پیتێکی زەننەدارەوە ڕوو دەدەن .

أ- ئەو مەددانەی بە هۆی ( همــــزة ) وە ڕوو دەدەن ، ئەوانیش سێ جۆرن:

١- مەددی پێویستی لکاو (المد الواجب المتصل ).

کاتێك بەدوای یەکێك لەپیتەکانی مەدد دا پیتی ( همـــزة ) بێت لەیەك وشەدا. ئەم درێژ کردنەوە پێویست (واجب)ە چونکە گشت خوێنەران ( القُرّاء ) بڕیاریان لەسەردرێژ کردنەوەی داوە.

ئەندازەی درێژ کردنەوەی:

چوار یا پێنج جوڵەیە، بەلاّم چوار جوڵە بەناوبانگترە. وە بۆیە پێی دەگوترێ لکاو (متصل) چونکە لەیەك وشەدا ڕوو دەدات.

نموونە:

﴿وَمَا تَفَرَّقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُمُ الْبَيِّنَةُ﴾ (البينة ٤)

﴿وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ﴾ (الفجر ٢٣)

﴿وَلَمَّا جَاءتْ رُسُلُنَا لُوطاً سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعاً وَقَالَ هَـذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾ (هود ٧٧)

﴿إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ﴾ (التوبة ٣٧)

﴿أَفَمَن كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِ كَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءهُمْ﴾(محمد ١٤)

تێبینی: ئەگەر پیتی (همزه) کەوتە کۆتایی وشەو لەسەری وەستایت دەتوانی (٤) یا (٥) یا (٦) جوڵە درێژی کەیتەوە، چونکە دەبێتە مەددی توش هاتوو بە زەننە ( العارض للسكون ) وەکو:

﴿ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ﴾ (الجمعة ٤)

﴿إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاء وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾(الممتحنة ٢)

﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَلَا الْمُسِيءُ﴾ (غافر ٥٨)

**٢- مەددی ڕێپێدراوی جیا** (المد الجائز المنفصل).

**کاتێك یەکێك لەپیتەکانی مەدد لەکۆتایی وشەیەکداو پیتی (همزة) لە سەرەتای وشەیەکی تردا بێت.**

**ئەندازەی درێژ کردنەوەی: دەتوانرێ (٢) یا (٤) یا (٥) جوڵە درێژ بکرێتەوە بەلاّم چوار بەناوبانگترە، هەر لەبەرئەوەشە پێی دەوترێ ڕێپێدراو (جائز). وە بۆیە پێ ی گوتراوە جیا (منفصل) چونکە لەدوو وشەدا ڕوو دەدات.**

**نموونە:**

﴿وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ (الكافرون ٥)

﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ (الكافرون ١)

﴿وَإِذَا انقَلَبُواْ إِلَى أَهْلِهِمُ انقَلَبُواْ فَكِهِينَ﴾ (المطففين ٣١)

﴿انطَلِقُوا إِلَى مَا كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ (المرسلات ٢٩)

﴿الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾ (قريش ٤)

**تێبینی:**

**ئەم جۆرە مەددە لەکاتی بەردەوام بوون (وصل) دا دروست دەبێت، خۆنەگەر لەسەر وشەی یەکەم وەستای لەدوو جوڵە زیاتر درێژ ناکرێتەوە.**

**٢- مەددی گۆڕاو ( البدل).**

**ئەگەر دوو (همزە) پێکەوە لەیەك ووشەدا کۆبوونەوە یەکەمیان بزواو و دووەمیشیان زەننەدار بوو ، ئەوا دووەمیان دەگۆڕێ بۆ پیتی مەدد (ا،و،ی) هەر لەبەر ئەوەشە پێ ی دەوترێ مەددی گۆڕاو. ئەندازەی دوو جوڵەش درێژ دەکرێتەوە .**

**نموونە:**

﴿فَكَيْفَ آسَى عَلَى قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾ (الأعراف ٩٣) **لەبنەڕەتدا** آسَى: ( أأسى ) **بووەو ( همزة ) زەننەدارەکە گۆڕاوە بۆ ( ألِف ).**

**هەروەها ووشەی: (آدم) لەبنەڕەتدا ( أأدم ) و(آتی) لەبنەڕەتدا ( أأتى) بووە.**

﴿قَالَ هَلْ آمَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلاَّ كَمَا أَمِنتُكُمْ عَلَى أَخِيهِ مِن قَبْلُ﴾ (يوسف ٦٤)، **لەبنەڕەتدا ووشەی** آمَنُكُمْ :( أأمنكم ) ) **بووە و( همزة ) زەننەدارەکە گۆڕاوە بۆ ( ألِف ).**

﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى﴾ (النحل ٩٠)، **لەبنەڕەتدا** (إِيتَاء): إئتاء **بووەو( همزة ) زەننەدارەکە گۆڕاوە بۆ ( ي ). هەروەها ووشەی**:(إيمان): (إئمان) **بووە و** (لِإِيلَافِ) **یش**: ( لإئلاف) **بووە.**

﴿وَمَا تَفَرَّقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُمُ الْبَيِّنَةُ﴾ (البينة ٤)، **ووشەی** (أُوتُوا): ( أؤتوا) **بووە و، ( همزة ) زەننەدارەکە گۆڕاوە بۆ ( و ).**

﴿قَالُواْ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِينَا وَمِن بَعْدِ مَا جِئْتَنَا﴾ (الأعراف ١٢٩)، **هەروەها ووشەی** (أُوذِينَا)**ش** :( أؤذينا ) **بووە.**

**مەددی لێکچوو بەگۆڕاو ( المد الشبیه بالبدل )**

**خوێنەری بەڕێز، هەر پیتێکی مەدد بەدوای ( همزة )دا هاتبێ زانایان بەپاشکۆی مەددی (بدل) یان داناوەو کردوویانە بەچەند بەشێکەوە :**

**١- ئەوەی لە بەردەوام بوون(وصل) و وەستان(وقف)دا درێژ دەکرێتەوە، وەکو : ووشەی (نَبِّؤُونِي) ئایەتی﴿نَبِّؤُونِي بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ (الأنعام ١٤٣)، ئەندازەکەشی (٢) جوڵەیە لەهەردوو حاڵەتی (وصل) و (وقف) دا.**

**٢- ئەوەی تەنها لە(وصل)دا درێژ دەکرێتەوە، وەکو: ووشەی (تَشَاؤُونَ)ی ئایەتی ﴿وَمَا تَشَاؤُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾(التكوير ٢٩) کەپێویستە لەحاڵەتی (وصل)دا (٢) جوڵە درێژ بکرێتەوە، بەلاّم لەحاڵەتی (وقف)دا (٦) جوڵە درێژ دەکرێتەوە چونکە دەبێتە مەددی توش هاتوو بەزەننە ( المدالعارض للسکون).**

**هەروەها ئەم ووشانەش: (مَآبِ)، (يُرَاؤُونَ)، (لَيَؤُوسٌ).**

**٣- ئەوەی تەنها لەسەرەتاوە درێژ دەکرێتەوە ، وەکو: وشەی (ائْتُونِي)ی ئایەتی ﴿أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِّن قَبْلِ هَذَا﴾ (الأحقاف ٤)، واتە لەکاتی (وصل)دا بە ( السماواتِــــتوني ) دەخوێنرێتەوە بەبێ مەدد. بەلاّم ئەگەر لەسەر ووشەی( الــــسَّمَاوَاتِ ) وەستایت و پاشان دەست کردەوە بەخوێندنی ( ائْتُونِي ) بە( إيــتوني ) دەیخوێنیتەوەو (٢) جوڵە درێژی دەکەیتەوە وەکو مەددی (بدل)، هەروەها ووشەی : (ائْذَن) لەئایەتی ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ائْذَن لِّي وَلاَ تَفْتِنِّي﴾ (التوبة ٤٩) گەر لەسەرەتاوە خوێنرایەوە بە( إيذن لي ) دەخوێنرێتەوە.**

(ائْتِنَا)ی ئایەتی ﴿وَقَالُواْ يَا صَالِحُ ائْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا﴾ (الأعراف ٧٧) گەر لەسەرەتاوە خوێنرایەوە بە (إيتنا) دەخوێنرێتەوە.

(اؤْتُمِنَ)ی ئایەتی ﴿الَّذِي اؤْتُمِنَ﴾(البقرة ٢٨٣) گەر لەسەرەتاوە خوێنرایەوە بە (أوتمن) دەخوێنرێتەوە.

ب- ئەو مەددانەی بەهۆی پیتێکی زەنندارەوە ڕوو دەدەن، ئەوانیش دوو جۆرن:

١- مەددی پێویست (المد اللازم).

٢- مەددی توش هاتوو بەزەننە (المد العارض للسكون).

١- مەددی پێویست (المد اللازم).

بریتی یە لە بەیەکگەیشتنی یەکێك لە پیتەکانی مەدد لەگەڵ زەننە(سکون) یێکی هەمیشەیی ،یا پیتێکی (شدّة)داردا، (چونکە هەموو پیتێکی (شدّة)دا لەبنەڕەتدا دووپیتە یەکەمیان زەننەدارو ئەوی تریشیان بزواوە.

ئەندازەی درێژ کردنەوەی : خوێنەران(القرّاء) یەك دەنگن لەسەر تەواو درێژ کردنەوەی تاوەکو (٦) جوڵە.

وەبۆیە پیێ ی دەوترێ لازم چونکە درێژ کردنەوەی تا ئەو ئەندازەیە پێویست (لازم) ە .

ئەم مەددەش دەکرێت بە دووبەشەوە:

أ- مەددی پێویستی ووشەیی (المد اللازم الكلمي)

ئەگەر مەددەکە لەیەك ووشە(کلمة) دا بێت، ئەمیش دەبێت بەدوو بەشەوە:

- قورس (مثقل): ئەگەر لەدوای پیتی مەددەوە پیتێکی (شدّة)دار هاتبێ. وەکو:

﴿وَلاَ الضَّـــالِّــينَ﴾ (الفاتحة ٧)

﴿الْحَـــاقَّـــةُ﴾ (الحاقة ١)

﴿قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ﴾ (يونس ٥٩)

﴿قُلْ آلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ الأُنثَيَيْنِ أَمَّا اشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ الأُنثَيَيْنِ﴾ (الأنعام ١٤٣)

- سووك (مخفّف) : ئەگەر لە دواى پيتە مەددەكە پيتێكى زەنندەدارى هەميشەى بێ (شدّة) هاتبێ.

**نموونە: لەقورئانى پيرۆزدا تەنها وشەى (آلآنَ) ە هەيەو دووجار لەسورەتى (يونس)دا هاتووە :**

﴿آلآنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ﴾ (يونس٥١).

﴿آلآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾ (يونس ٩١)

**مەددى جياكردنەوە (مد الفَرق)**

**ئەم جۆرە مەددە ش زانايان بەبەشێك لە مەددى پێويستى وشەيى (المد الــلازم الكلمــي) دادەنێن، وەبۆيە واى پێ دەوترێ، چونكە (خبر) و (إستفهام) لەيەك جيا دەكاتەوەو، تەنها لە شەش شوێن لە قورئاندا هاتوە: لەدوو شوێنى سورەتى (الأنعام)دا:( قُلْ آلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ الْــأُنثَيَيْنِ ((١٤٣و١٤٤). يەك جاريش لەسورەتى (يونس)دا: قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ [٥٩]**

**جارێكيش لەسورەتى (النمل) دا: ( آللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ) (٥٩).**

**دوو جاريش لەسورەتى (يونس) دا: ( آلْآنَ وَقَدْ كُنتُمْ بِــهِ تَــسْتَعْجِلُونَ ) (٥١)، ( آلْآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ ) (٩١).**

ب- مەددی پێویستی پیتی (المد اللازم الحرفي)

کاتێک مەددەکە لەیەکێك لەوپیتانەدا ڕووی دابێت کە لە سەرەتای هەندێ لە سورەتەکاندا هەیە و بە سێ پیت دەخوێندرێنەوەو پیتی ناوەڕاستیان مەدد یا (لین) بێت، واتە پیتەکانی ڕستەی (نقص عسلکم).

ئەمیش دەکرێت بە دوو بەوشەوە :

- قورس: ئەگەر دوای پیتی مەدد پیتێکی تێهەڵکێش کراو (مدغم) هاتبێ. وەکو :

﴿الم﴾ (البقرة ١)، (ألف لام ميم ) دەبینی پیتی (م) کە زەننەدارە و دەگات بە میم (ادغام) دروست ئەکا،جا کەپیتی(ا) ئەگات بەم (إدغام) دەبێ(٦) جوڵە درێژ بکرێتەوە بۆ مەددێکی لازم.

﴿طسم﴾ (الشعراء ١)، = (طا سين ميم ) .

- سووك: ئەگەر دوای پیتی مەدد پیتێکی زەننەداری تێهەڵکێش نەکراو هاتبێ. وەکو:

﴿ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ (ق ١) ، بە(قاف) دەخوێنرێتەوە .

﴿ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ﴾ (ص ١) ، بە(صاد) دەخوێنرێتەوە .

﴿المر﴾ بە (ألف لام ميم ) دەخوێنرێتەوە،کەواتە پیتی (لام) لازمی قورسەو،پیتی (میم) لازمی سوکە .

لەم خشتەیەی خوارەوەدا پیتەکان و ئەندازەی درێژکردنەویان ڕوون کراوەتەوە :

| | پیتەکان | ئەندازەی درێژکردنەوەیان |
|---|---|---|
| یەکەم | الألف (ا) | درێژ کردنەوەی نیە |
| دووەم | الكاف (ك) | مەددی پێویست(لازم) (٦)جوڵە |
| | الميم (م) | " " " " " |
| | العين (ع) | " " " " " |
| | السين (س) | " " " " " |
| | اللام (ل) | " " " " " |
| | النون (ن) | " " " " " |
| | القاف (ق) | " " " " " |
| | الصاد (ص) | " " " " " |
| سێیەم | الحاء (ح) | مەددی ئاسایی( طبيعي ) (٢)جوڵە |
| | الياء (يا) | " " " " " |
| | الطاء (طا) | " " " " " |
| | الهاء (ها) | " " " " " |
| | الراء (ر) | " " " " " |

**تێبینی : پیتی(ع: عین) لەسەرەتای سورەتی مریم ﴿کهیعص﴾ و سەرەتای سورەتی الشوری ﴿عسق﴾ دا دەتوانریٚ (٦) شەش جوڵە درێژ بکرێتەوە چونکە مەددی لازمەو، دەشتوانریٚ (٤) جوڵە درێژ بکرێتەوە و بەمەددی (لین) حیسابی بۆ بکرێت.**

**٢- مەددی توش هاتوو بەزەننە** (المد العارض للسكون).

**بریتی یە لەو مەددەی بەهۆی گەیشتنی یەکێك لە پیتەکانی مەدد بە پیتێك کە بەهۆی وەستانەوە لە سەری زەننەدار (ساکن) بووبیٚ، واتە لەبنەڕەتدا زەننەدار نیە.**

**ئەمیش دەکرێت بەچەند بەشێکەوە:**

**أ- مەددی توش هاتوو بەزەننە کەلەبنەڕەتدا مەددی ئاسایی یە، دەتوانریٚ لەحاڵەتی وەستان (وقف)دا (٢)یا(٤)یا(٦) جوڵە درێژکرێتەوە. وەکو:**

(الْأَوْتَادِ) **لە ئایەتی** ﴿وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ﴾ (الفجر ١٠)

(بِالدِّينِ) **لە ئایەتی** ﴿كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ﴾ (الانفطار ٩)

(تَفْعَلُونَ) **لە ئایەتی** ﴿يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾ (الانفطار ١٢)

**ب- مەددی توش هاتوو بەزەننە کەلەبنەڕەتدا مەددی (لین)ەو، دەتوانریٚ لەحاڵەتی وەستان (وقف)دا (٢)یا(٤)یا(٦) جوڵە درێژکرێتەوە. وەکو:**

(وَالصَّيْفِ) **لە ئایەتی** ﴿إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاء وَالصَّيْفِ﴾ (قريش ٢)

(الْبَيْتِ) **لە ئایەتی** ﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ﴾ (قريش ٣)

(خَوْفٍ) **لە ئایەتی** ﴿الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾ (قريش ٤) .

ج- مەددی توش هاتوو بەزەننە کەلەبنەڕەتدا مەددی گۆڕاو (بدل)ەو، دەتوانرێ لەحاڵەتی وەستان (وقف)دا (٢)یا(٤)یا(٦) جوڵە درێژکرێتەوە. وەکو:

(الْمَآبِ) لە ئایەتی ﴿وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ﴾ (آل عمران ١٤)

(خَاطِئِينَ) لە ئایەتی ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ﴾ (القصص ٨)

(يُرَاؤُونَ) لە ئایەتی ﴿الَّذِينَ هُمْ يُرَاؤُونَ﴾ (الماعون ٦)

د - مەددی توش هاتوو بەزەننە کەلەبنەڕەتدا مەددی پێویستی لکاو (الواجب المتصل)ە کاتێك (همزة)کەی کەوتبێتە کۆتاییەوە، لەحاڵەتی وەستان (وقف)دا دروستە(٤)یا(٥)یا(٦) جوڵە درێژکرێتەوە. وەکو وەستان لەسەر ووشەی:

(يَشَاءُ) لە ئایەتی ﴿ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ﴾ (الجمعة ٤) .

(بالسُّوءِ) لە ئایەتی ﴿إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاء وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ﴾ (الممتحنة ٢) .

(الْمُسِيءُ) لە ئایەتی ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَلَا الْمُسِيءُ﴾ (غافر ٥٨) .

تێبینی: سەبارەت بەدرێژ کردنەوەی توشهاتوو بە زەننەباشتروایە(٤) یا (٦) جوڵە درێژ بکرێتەوە .

**مەددی ( صلة )**

بریتی یە لە(ه)ی ڕاناو کە بۆ تاکی ئامادە نەبووی نێر بەکاربێت، وەکو: عندە ، کمثلة ، بعدە .

**حوكمی درێژكردنەوەی: لەڕووی درێژكرنەوەوە دوو حاڵەتی هەیە:**

**یەكەم :حاڵەتی درێژ نەكردنەوە (القصر): (ه)ی ڕاناو لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا درێژ ناكرێتەوە:**

**ا- ئەگەر كەوتە نێوان دووپیتی زەنندارەوە، وەكو :**

﴿وَهَدَيْنَـــاهُ النَّجْدَيْنِ﴾ (البلد ١٠)

﴿وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللّهُ﴾ (البقرة ١٩٧)

**ب- ئەگەر پێشەوەی بزواو (متحرك) و دواوەی زەننەبوو، وەكو:**

﴿فَيُعَذِّبُهُ اللَّهُ الْعَذَابَ الْأَكْبَرَ﴾ (الغاشية ٢٤)

**ج- ئەگەر پێشەوەی زەننەو دواوەی بزواو بوو، وەكو :**

﴿ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ (القدر ١)

**تێبینـی: لەیـەك شـوێنی قورئانـدا (ه)ی ڕانـاو پێـشەوەی زەننـەدارو دواوەی بزواوەو دوو جوڵەش درێژ دەكرێتەوە:**

﴿وَيَخْلُدْ فِيـــهِ مُهَانـــاً﴾ (الفرقـــان ٦٩)، **لـەلای (حفـــص) بـە (فیهـــي مهانـــا) دەخوێنرێتەوە.**

**دووەم : حاڵەتی درێژ كردنـەوە (المد): ئەگەر (ه)ی ڕاناو كەوتـە نێوان دووپیتی بزواو (متحرك)ەوە، ئەمیش دووجۆرە :**

**أ- مەددی (صلة)ی بچوك: ئەگەر پیتـی (همزە) ی بەدواوە نـەبوو، ئـەوە مەددی ئاسایی (طبيعي)یەو دووجوڵە درێژ دەكرێتەوە،واتە ئەگەر ژێـری هـەبوو ئەنـدازەی (ی)وە ئەگـەر بـۆری هـەبوو ئەنـدازەی (و) درێـژ دەكرێتەوە. وەكو:**

﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحَدٌ﴾ (الإخلاص ٤)

وەلە (مصحف) دا (و) یێکی بچووك یا (ی) یەکی بچووکی بۆ دانراوە، وەکو: ﴿إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٌ﴾

ب - مەددی( صلة ) ی گەورە : ئەگەر پیتی ( همزة )ی بەدواوە بوو.

ئەندازەی درێژ کردنەوەی : هەر وەك مەددی (منفصل) وایە (٤) یا (٥) جوڵە.

نموونە:

﴿وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّى﴾ (الليل ١١)، کەبەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: ( ماهو إذا)

﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُ أَحَدٌ﴾ (البلد ٧)

﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾ (المطففين ١٢)

﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾ (المطففين ١٢)

تێبینی:

١- لەسێ شوێنی قورئانی پیرۆزدا (ه)ی ڕاناو کەوتۆتە نێوان دوو پیتی بزواو بەڵام درێژ نا کرێتەوە، کەئەمانەن:

﴿وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ (الزمر ٧).

﴿اذْهَب بِّكِتَابِي هَذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ﴾ (النمل ٢٨) بە زەننە (سکون) دەخوێنرێتەوە.

﴿قَالُواْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ﴾ (الأعراف ١١١) (الشعراء ٣٦) لێرەشدا هەر بە زەننە دەخوێنرێتەوە.

٢- (ه)ی ( إسم الإشارة ) هەمان حوکمی (ه)ی ڕاناوی هەیە:

﴿إِنَّ هَذِهِ تَذْكِرَةٌ﴾ (الانسان ٢٩)، (٢) جوڵە درێژ دەکرێتەوە چونکە پیتی ( همزة ) لەدوایەوە نەهاتووە .

﴿وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ﴾ (المؤمنـــون ٥٢)، (٤) يا (٥) جوڵە درێژ دەکرێتەوە چونکە پیتی (همزة) لەدوایەوە هاتووە .
﴿هَذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنـــتُم بِهَـــا تُكَـــذِّبُونَ﴾ (الطـــور ١٤)، لێرەدا هیچ درێژ ناکرێتەوە چونکە دواوەی پیتێکی زەنندارە .



## بەشی دەیەم

## وەستان و بەشەکانی

وەستان (الوقف)و دەست پێکردن (الإبتـــداء) بەیەکێك لەبەشەگرنگەکانی زانستی (تجوید) دادەنرێت چونکە بەهۆی زانین و جێبەجێکردنیەوە واتای ئایەتەکان ڕوون و ئاشکرا دەبێت بۆ خوێنەرو بیسەر.
پێشەوا(علی) خوای لیّ ڕازیبێت لەڕاڤەی ئایەتی ﴿ ورَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً ﴾ (المزمل ٤) دەفەرموێت: هو تجويد الحروف، ومعرفة الوقـــوف.[٥٩] واتە: چاك خوێندنەوەی پیتەکان و زانینی وەستانەکانە .

پێناسەی وەستان (الوقف): بریتی یە لە بچڕاندنی دەنگ و وەستان لەسەر کۆتایی ووشەیەك،بەو مەرجەی هەناسە وەرگریّ و نیازی دەستپێکردنەوەی هەبێت.
وەستان دەکرێت بە (دوو) بەشی سەرەکیەوە :
یەکەم : وەستانی ناچاری (وقف اضطراري) : بریتی یە لەوەستانی خوێنەر بەهۆی هەناسە تەواو بوونەوە یا تەنگە نەفەسیەوە یا پژمەو کۆکەو هەرشتێکی تر لەوبابەتانە.

---

[٥٩] الإتقان في علوم القرآن للسيوطي (١/٢٢١)

ئەم جۆرە وەستانەش لەهەموو کاتێکدا دروستە، بەڵام چاکتر وایە کەخوێنەر تابۆی دەکرێ ووشەی گونجاو هەڵبژێرێ بۆ وەستانەکەی. لەکاتی دەستپێکردنەوەشدا ئەگەر ووشەی دوای وەستانەکەگونجاو بوو لەوێ وە دەست پێدەکاتەوە ئەگەر نا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی گونجاوە بۆ دەست پێکردنەوە.

دووەم : وەستانی ئارەزوو (إختياري) : بریتیە لەوەستانی خوێنەر بەویست و ئارەزووی خۆی، ئەمیش دەکرێت بەدوو بەشەوە :

أ- وەستانی ئارەزووی دروست (إختياري جائز) ئەمیش چوار جۆرە:

١- وەستانی پێویست لازم : وەستانی ڕوونکردنەوە (البيان)یشی پێ دەوترێ،ئەمیش وەستانە لەسەر ووشەیەك ئەگەر بگەیەنرێ بەوەی دوای خۆی مانای ئایەتەکە لای خوێنەر دەشێوێ، بۆیە لەسەری پێویستە. نموونە:

- وەستان لەسەر ووشەی(قَوْلُهُمْ) لە ئایەتی ﴿وَلاَ يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ . إِنَّ الْعِزَّةَ لِلّهِ جَمِيعاً هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (یونس ٦٥)

- وەستان لەسەر ووشەی(عَنْهُمْ) لە ئایەتی﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ . يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِ إِلَى شَيْءٍ نُّكُرٍ﴾ (القمر ٦)

لە(مصحف)یشدا نیشانەی بۆ دانراوە کەپیتی (م)ە بەبچووکی:

فَتَوَلَّ عَنْهُمْۘ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ

٢- وەستانی تەواو(تام): وەستان لەسەر ووشەیەك کەمانای تەواو بێت وهیچ پەیوەندی نەبێ بەوەی بەدوای دا دێت نەلەڕووی مانا و نەلەڕووی (إعراب)ەو . وەکو وەستان لەسەر کۆتایی سورەتەکان یا کۆتایی چیرۆکەکان یاکۆتایی سیفاتی ئیمانداران یا بێباوەڕان

یاجیاکردنەوەی ئایەتی سزا لەئایەتی بەزەیی یاتەواوبوونی باسی بەهەشت یا دۆزەخ یا لەکاتی تەوا بونی هەربابەتێك و دەست پێکردن بەبابەتێکی تر،ئەم جۆرە وەستانی هەڵبژێرراو (المختار) یشی پێدەوترێت، واباشیشە خوێنەر لەسەری بوەستێت. وەکو:

- وەستان لەسەر ووشەی(المفلحون) ی سورەتی ( البقرة ) .﴿أُوْلَـئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ * إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ (البقرة ٥-٦) چونکەباسی سیفاتی(المتقین)تەواودەبێت سیفاتی بێباوەڕان دەست پێدەکات.
- وەستان لەسەر ووشەی(للکافرین) ی ئایەتی ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ (البقرة ٢٤) چونکە باسی دۆزەخ تەواو دەبێت باسی بەهەشت دەست پێدەکات.
- وەستان لەسەر ووشەی ( الثواب ) ی ئایەتی ﴿وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ * لاَ يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُواْ فِي الْبِلاَدِ﴾ (آل عمران ١٩٥-١٩٦)، چونکە ئەم دووئایەتە هیچ پەیوەندیەك لەنێوانیاندا نی یە نەلەڕووی مانـاو نەلەڕووی(إعراب)ەوە .

٦- وەستانی (کافی): وەستانە لەسەر ووشەیەك تەنها لەڕووی (إعراب)ەوەپەیوەندی هەیە بەوەی بەدوایدا دێت.

حوکمی ئەم وەستانە : وەستان و دەست کردنەوە بەخوێندنیش لەووشەی دوای وەستان پەسەندکراوە، وەکو :

وەستان لەسەر ووشەی( الْبَيْتِ ) لە ئایەتی ﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ * الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾(قریش ٣-٤)

٢- وەستانی باش(حسن): وەستانە لەسەر ووشەیەك مانای تەواوبێت بەڵام لەڕووی ماناو (إعراب)یشەوە پەیوەندی هەیە بەوەی بەدوایدا دێت، حوکمی ئەم وەستانە: وەستان لەسەری باشترە، بەڵام باش وایە بەوەی کەبەدوا وەستانەکەدا دێ دەست پێ نەکەینەوە، بەڵام ئەگەر کۆتایی ئایەت بوو ئاساییە . وەکو:

وەستان لەسەر (الْحَمْدُ للّهِ)ی سوڕەتی (الفاتحة) کەوەستانێکی باشە، بەڵام دەست پێ کردنەوە بە(رَبِّ الْعَالَمِينَ) باش نی یە.

وەستانی ئارەزوی قەدەغە (إختياري ممنوع )

وەستانی خوێنەر بەویستی خۆی لەسەر ووشەیەك کەمانای تەواونی یە، چونکە لەڕووی ماناو (إعراب)یشەوە پەیوەندی هەیە بەوەی بەدوایدا دێت .

حوکمی ئەم وەستانە : دروست نی یە لەکاتی ناچاریدا نەبێ، وەك : کۆکەو پژمەو هەناسەتوندی، لەم حاڵەتەشدا پێویست(واجب)ە لەکاتی دەست پێکردنەوەدا بگەرێیتەوە بۆ پێش وەستانەکە بۆئەو شوێنەی مانای تەواو دەبەخشێ .

ئەمیش چەند پلەیەکی هەیە :

- هەندێکی دەقەکە پیرۆزەکە والێ دەکەن کەهیچ واتایەك نەبەخشێ، وەکو :

وەستان لەسەر (وَهَلْ أَتَاكَ) ئایەتی﴿وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَى﴾ (طه ٩)

وەستان لەسەر (اسْمَ) ئایەتی ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ (الأعلى ١)

- لەویش خراپتر ئەوەیە واتاکە پێچەوانە بکاتەوە، وەکو:

وەستان لەسەر (وَالْمَوْتَى) ئایەتی ﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَالْمَــوْتَى يَبْعَثُهُمُ اللّهُ﴾ (الأنعام ٣٦)

وەستان لەسەر (الصَّلاَةَ) ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾ (النساء ٤٣)

- لەهەموو ئەمانە خراپتر ئەوەیە وەستانەکە واتایەك بگەیەنێ کەپێچەوانەی بیرو باوەڕی ئیسلامی بێت، وەکو:

وەستان لەسەر (يَهْدِي) ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ (المنافقون ٦)

وەستان لەسەر (يَسْتَحْيِي) ئایەتی ﴿وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ﴾ (الأحزاب ٥٣)

## السكت

السكت : واتەبێ دەنگ بوون یا بچڕاندنی دەنگ بێ هەناسە وەرگرتن .

شوێنەکانی (السکت) لەقورئانی پیرۆزدا لەریوایەتی (حفص) لە (عاصم)ەوە چوار ( سكتة ) لەقورئاندا هەیە کەزانایان لەسەری یەکدەنگن، کەئەمانەن:

١- ( سكتة )ی نێوان هەردوو وشەی (عِوَجًا) و(قَيِّماً) لەئایەتی ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجًا * قَيِّماً لِّيُنذِرَ بَأْساً شَــدِيداً مِن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (الكهف ١-٢)،واتە: وەستان بێ هەناسە وەرگرتن لەسەر( عوجاً ) هەروەها بەبێ (تنوین)

٢- ( سكتة )ی نێوان هەردوو وشەی (مَّرْقَدِنَا) و(هَذَا) في قوله تعالى ﴿قَالُوا يَا وَيْلَنَا مَن بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا هَذَا مَا وَعَدَ الرَّحْمَنُ وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ﴾(يس٥٢)، لێرەدا وەستانی تەواو(الوقف التام)یش دروستە .

٣- (سكتة)ی نێوان هەردوو ووشەی (مَنْ) و(رَاقٍ) في قوله تعالى ﴿وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ﴾ (القيامة ٢٧)

٤- (سكتة)ی نێوان هەردوو ووشەی (بَلْ) و(رَانَ) في قوله تعالى ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (المطففين ١٤)

لەم چوار شوێنەدا نیشانەیەك بۆ (سكتة) دانراوە، ئەویش پیتی (س)ە بەبچوكی وەكو وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ

دوو(سكتة)ی تریش لەقورئاندا هەیە بەلاّم لەنێوان زانایاندا مشت و مڕی لەسەرە:

١- نێوان هەردوو سوڕەتی (الأنفال) و(التوبة) : ﴿إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ * بَرَاءَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (الأنفال ٧٥ – التوبة ١) لێرەدا وەستانی تەواو هەروەها (سكت) لەسەر کۆتایی سوڕەتەکە دروستە.

دەشتوانی کۆتایی سوڕەتەکە بگەیەنی بەسەرەتای سوڕەتی (التوبة) واتە بە (إقلاب) ی(تنوین)، بەلاّم وەستانی تەواو ڕای بەهێزترە .

٢- نێوان هەردوو ووشەی (مَالِيَهْ) و(هَلَكَ) في قوله تعالى ﴿مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ * هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ﴾ (الحاقة ٢٨-٢٩)

## نیشانەكانی وەستان

م: نیشانەی وەستانی (لازم).

لا: نیشانەی وەستانی قەدەغە.

صلی: نیشانەی وەستانی ڕێپێدراو، بەڵام بەردەوام بوون (وصل) چاكترە.

قلی: نیشانەی وەستانی ڕێپێدراو ، بەڵام وەستان (وقف) چاكترە.

ج: نیشانەی وەستانی ڕێپێدراو، (وەستان و بەردەوام بوون وەك یەكن).

∴ ∴ ئەگەر لەسەر یەكێك لەم دوو نیشانەیە بوەستی لەسەر ئەوی تریان ناوەستی، دەشتوانی لەسەر هیچ كامیان نەوەستی.

وەكو : ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ ∴ فِيهِ ∴ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة ٢)

## سەرچاوەكان


١- القرآن الكريم

٢- برنامج أحكام التجويد

٣- فنّ التجويد: عزّة عُبيد دعّاس

٤- البسيط في علم التجويد: بدر حنفي محمود

٥- طريقة تدريس القرآن الكريم :

٦- أحكام التلاوة: عادل نصار

٧- أحكام التجويد :

٨- متن الجزرية: شمس الدين محمد بن الجزري.

٩- صحيح البخاري: محمد بن إسماعيل بن إبراهيم بن المغيرة البخاري .

١٠- صحيح مسلم: مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري النيسابوري.

١١- السلسلة الصحيحة:محمد ناصر الدين الألباني .

١٢- شرح رياض الصالحين: محمد بن صالح بن محمد العثيمين .

١٣- مسند أحمد بن حنبل: أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني، بتحقيق : شعيب الأرنؤوط.

١٤- مجموع الفتاوى : تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني، بتحقيق أنور الباز و عامر الجزار .

١٥- تفسير العلامة محمد العثيمين : محمد بن صالح بن محمد العثيمين .

١٦- الإتقان في علوم القرآن : عبد الرحمن بن الكمال جلال الدين السيوطي.

١٧- تەفسيری ڕامان : ئەحمەد كاكە محمود .

١٨- قورئانی پیرۆز چۆن بخوێنینەوە؟: صلاح الدين محمد بهاءالدين

١٩- هونەری جوان خوێندنەوەی قورئان : وەرگێڕانی عومەر خطابي

٢٠- ئەنتەرنێت.

## ناوەرۆك

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

وشەی ( تجوید ) لە زمانەوانیدا واتە: جوانکاری و شارەزا بوون.
لە زاراوەشدا: زانستێکە ئەو بنەما و یاسایانە ڕون دەکاتەوە کە پێویستە ڕەچاو بکرێن لەکاتی قورئان خوێندندا، بەو شێوەیەی کە هاوەڵان خوایان لێ ڕازی بێت لە پێغەمبەری خواوە ( صلی الله علیه و سلم ) وەریانگرتووە.






چاپەمەنی سیما سلێمانی

ژمارە سپاردنی ١٦١٦ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە